## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: ئەفسانەی کوردی
بابەت: ئەفسانە (ئەدەبیاتی فۆلکلۆر)
نووسەر: ڕێبوار جەمال سەگرمە
دیزاین: سەرکەوت پ
تیراژ: ١٠٠٠
نرخ: ٣٠٠٠
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
شوێنی چاپ: چاپخانەی کارۆ
* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( )ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە.

* لەسەر ئەرکی بودجەی پایتەختی ڕۆشنبیری چاپکراوە.

# ناوەرۆک

# پێشەکی

**ئەفسانە بەرهەمی بیر و خەیاڵی مرۆڤی سەرەتاییە، چیرۆکخوانەکان توانیویانە ڕووداوەکانی ڕابردوو یان ڕۆژگاری خۆیان بێنن، لە چوارچێوەیەکی ئەدەبیدا دایڕێژن، هەندێ جار تێکەڵاو بە خەون و خەیاڵی خۆیانی بکەن و بە زمانێکی پەتی دەریان ببڕن، پاشان وەك بەرهەمێکی سەرزاریی دەماودەم و پشتاوپشت لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گوێزراونەتەوە، لەهەر سەردەمێکدا، بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان لەلایەن گەلەوە شتیان بۆ زیاد و کەم کراوە و بەپێی سەردەمەکە گونجێنراون.**

**ئەفسانەکانی ناوچەی موکریان، لەسەر زاری چیرۆکخوانەکان بڵاوە، شەوانە لە گوێ ئاگرداندا دەیگێڕنەوە، نزیکەی دە ساڵ لە ناوچەی پشدەر مامۆستا بووم، چەند جارێك ناوی ئەم داستانانەم بەرگوێ کەوت، پاشان هەوڵمدا، ئەو کەسانە بدۆزمەوە کە پیر و بەتەمەنن، ئەفسانەکانیان لەبەرە و توانای گێڕانەوەیان هەیە، لە ئەنجامدا چیرۆکخوانێکی ناوچەکەم دۆزییەوە، بەناوی (حاجی ڕەسوڵ حاجی عەلی) لە گوندی ئیسێوە، لە زاری خۆیەوە بەرهەمەکانم وەرگرت و تۆمارم کرد.**

**لەو بڕوایەدام گرنگیی نووسینەوە و چاپکردنی ئەفسانەی فۆلکلۆریی کوردیی لەوەدایە، چێژی تایبەتی بە خوێنەر دەبەخشێ و لە هەمان کاتیشدا دەبێتە هەوێنی دەیان توێژینەوەی زانستیی لە ئایندەدا، هەروەها گرنگییەکی دیکەی لەوەدایە، کە بە بەشە شێوەزاری ناوچەکە نووسیومەتەوە، بۆیە هۆیەك دەبێ بۆ سەرلەنوێ بووژاندنەوە و پاراستنی وشەی شێوەزارەکە، بەمەبەستی بەراوردکردنیش لە نێوان بەشە شێوەزاری موکریان و سلێمانیدا، فەرهەنگۆکێکی بچووکم لە**

کۆتایی بەرهەمەکەدا دروستکردووە و دەیان وشەی ناوچەی موکریانم تێدا پێشکەشکردووە، بێگومان ئەمەش لە ڕووی واتاسازیی و وشەسازیی، گرنگیی تایبەتیی هەیە، لەگەڵ ئەمەدا، لە پەراوێزیشدا هەندێك وشەم لێکداوەتەوە.

بەپێویستم زانی ئەم بەرهەمە بەو کتێبە چاپکراوانە بەراوردبکەم کە تایبەتن بە ئەفسانەی فۆلکلۆریی کوردیی، بۆ ئەم مەبەستە دەستم بە گەڕانکرد، بە دوای ئەو کتێبانەدا و گەلێك کتێبخانەم بەسەرکردەوە، تا لە ئەنجامدا توانیم بە داستان و چیرۆکگەلی نێو سی و حەوت کتێب بەراوردبکەم و بۆم دەرکەوت، ئەم بەرهەمە شایانی بڵاوکردنەوەیە.

لە کۆتایدا، سوپاس و پێزانینی تایبەتیم، بۆ هەموو ئەو کەسانەی هەیە، کە هاوکاریان کردم، هیوادارم کەڵکێکی بچووکم بە کتێبخانەی کوردیی گەیاندبێ، بۆ ئەوەی بەهەموومان بتوانین دڵسۆزانە خزمەتی ئەدەبیاتی گەلەکەمان بکەین.

ڕێبوار جەمال سەگرمە

٢٠٠٩-٧-٢٨

# وتەیەکی پێویست لەسەر ئەفسانە

ئەفسانە بەشێکە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیی، بەرهەمێکی بەپێزە، ڕووداوەکانی پڕ گرێوگۆڵ و چڕوپڕن، پاڵەوانەکانی پڕ هێز و توانا و ئەفسانەیی و خەیاڵاوین، توانای ئەنجامدانی کای گەورەیان هەیە، کە لە توانی مرۆڤی ئاساییدا نین، لە نێو بابەتی ئەفسانەدا کۆمەڵێ دێو و درنج و شتی سەیر و سەرسوڕهێنەر هەیە، کە مرۆڤ لە کاتی خوێندنەوەدا دەباتە دنیایەکی تایبەتەوە، بە هەموو مانایەك ئەفسانە بەرهەمی بیروخەیاڵی مرۆڤە.

ئەفسانە لە دەیان ڕووداو پێکدێ، لە ڕووی کاتەوە ڕووداوەکان دەیان ساڵ دەکێشن، جگە لە پاڵەوانی سەرەکی، چەند پاڵەوانێکی تری لاوەکی هەیە، لە ڕووی بابەتەوە دوور و درێژە، بۆیە چیرۆکخوان بە چەند شەوێك دەیگێڕێتەوە.

ئەفسانە لە ڕووی گێڕانەوەوە تایبەتمەندی هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە تەنیا چیرۆکخوانەکانی ناوچەکە توانای گێڕانەوەیان هەیە، نەك هەموو کەس، لەبەر ئەوەی پڕ گرێوگۆڵن، هەروەها دەیان ناوی سەیر و سەمەرەیان تێدایە، کە بە ئاسانی لەبەرناکرێن، لە کاتی گێڕانەوەیاندا، چەندین کاژێری دەوێ.

لە ناوچەی موکریان چەندین کەس هەن کە چیرۆکخوانن، توانی گێڕانەوەی ئەفسانەی ناوچەکەیان هەیە، بە شێوەی پشتاوپشت و دەماودەم بیستویانن و دەیانگێڕنەوە، لە کاتی گێڕانەوەیدا، لەگەڵ ئەوەدا بەپێی سەردەم شتی بۆ زیاد و کەم دەکەن، هێندە بەتام و لەزەت دەیگێڕنەوە، سەرنجی گوێگر بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن، کە خەڵکی ئاسایی ئەم توانا و هێزەی نییە، هەروەها شەوی گوێ ئاگردانی کوردەواریی پێگەرم دەکەن.

# سەلیمی جەوهەریی[1]

لە مێژووی دێرینی کوردەواییەوە، پێشینان دەگێڕنەوە و دەڵێن:
لەسەر چیایەکی بەرز، شارێك هەبوو، ناوی باڵێلان بوو، چیاکە دارستانی گەورەی هەبوو، سەدان کانی و سوولی[2] هەبوو، لە بەهاراندا، پڕ بوو لە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ، چاو لە بینینی تێر نەدەبوو.
وەکو پێشینان دەگێڕنەوە، پاشا باڵێلە ئەو شارەی درووستکرد بوو، ئەو جێگە سەختەی هەڵبژارد بوو، بۆ ئەوەی دوژمنان بە ئاسانی دەستیان نەیگاتێ.
شارەکەی زۆر بەباشی بنیاتنابوو، شورای گەورە و بەرزی هەبوو، هەر کەسێك ئەو شورا قایم و بەرزانەی دەبینی سەرسام دەبوو، چۆن ئەو هەموو بەردە گەورە گەورەیە، وەك کەڵەك لەسەر یەك دانراوە، جێگەی تێڕامانە!
شارەکە بەقەدەر پانی و درێژی لوتکەی چیاکە بوو، لە هیچ لایەکەوە ڕێگەی سەرکەوتنی نەبوو، تەنیا ڕێگەیەکی هەبوو، کە دەکەوتە لای ڕۆژهەڵاتی چیاکەوە، وەك کورد دەڵێت:
ڕێگەکە جێگەی کەر و بارێك دەبوو، نەدەبوو.
سنووری شاری باڵێلە زۆر فراوان نەبوو، نزیکەی سەد ماڵی تێدا نیشتەجێبوو، لەبەر ئەوەی زەوی کشتوکاڵیان نەبوو، بۆ بژێوی ژیان،

---

١- داستانی (سەلیمی جەوهەریی)ە. لێرەدا پێویستە ئەوە بلێم: کە پێش من مامۆستا (ئەحمەد شادی) لە کتێبی (چەپکێك چیرۆکی فۆلکلۆریی)، لە لاپەڕە ٨٧ دا داستانی (سەلیمی جەوهەریی) بڵاوی کردۆتەوە، دوای ئەوەی بەراووردی هەر دوو تێکستەکەم کرد، بۆم دەرکەوت کە لە ڕووی ڕووداو و داڕشتنەوە و ناوەرۆکەوە جیاوازیان زۆرە، بۆیە بە پێویستمزانی بەم شێوەیەی تریش بڵاوبێتەوە.

٢- سوول: تاڤگە.

هەنـدێك لـە خەڵکەکـەی پـەنایان بـۆ باخـداری و ئاژەڵـداری بـرد بـوو، هەروەها لەبەر ئەوەی سنووریان بە شارەکانی سـەرکاوڵان و ئاشکانەوە هـەبوو، هەنـدێکی تریـان خـەریکی کـاری حـەمباڵی و کـاری بازرگـانی بـوون. بـەو شـێوەیە خـەڵکی شـاری بـاڵێلان بـە ئاسـوودەیی و بێکێشـە دەژیان.

لەو شارە جوانەی باڵێلان پاشایەك هەبوو، تەنیا کوڕێکی هـەبوو، زۆری خۆشدەویست، ڕۆژگار هات و ڕۆیشت، کوڕەکەی پاشا تووشی دەردێك بـوو، بـە هـیچ حـەکیم و لوقمانێـك چـاری نـەکرا، بـەو دەردە حـەیاتی ڕەشیدا[٣].

پاشا زۆری پەرۆش بوو، وایلێهات لە جێگەدا کەوت، قسەی بۆ نـەکرا و زاری بەسترا، بە هیچ حەکیمێك چار نەکرا، خـەڵکی وڵات زۆر پەرۆشـی پاشایان بوو.

پاشا بۆ خەڵکەکەی بەخزمەت بوو، هاوکاری هەژارانی دەکرد، هـەوەرها پیـاوێکی دادپـەروەر و مـرۆڤ دۆسـت بـوو، بۆیـە ئـەو کاتـەی کـوڕە تاقانەکەی بە نەخۆشی مرد، خەڵکی شـار لـەبیری ئەوەدابوون، دەتـوانن چی بۆ پاشاکەیان بکەن، مقۆمقۆیان بوو، چونکە پاشا زاری بەسترابوو، نەیـدەتوانی قسـان بکـات، تـەنیا بـە ئامـاژە دەدوا. ئەمـە چـەند مـانگێگ درێژەی کێشا.

لە شاری باڵێلان، لە وەرزی بەهاردا، وەکو هەموو ساڵانی پێشوو، پیری موبـارەك پەیـدابوو، چـونکە هـەموو سـاڵێك لـەو وەرزەدا، دەردەکـەوت و ئامۆژگـاری خـەڵکی بـۆ کـاری چـاکە دەکـرد، پاشـان ئاهـەنگی جـەژنی بەهارەی لەگەڵ دەکردن.

٣- حەیاتی ڕەشیدا: مرد، گیانی دەرچوو.

خەڵکی باڵێلان لای پەرستگەی گەورەی شار، لە دەوری پیری موبارەك کۆبوونەوە، پاشان چوونە ناو پەرستگەکە، دوای ئەوەی پیری موبارەك لە وتە و ئامۆژگارییەکانی بووەوە، هەندێك لە ماقوڵانی شار بە پیری موبارەکیان گوت:

پاشای وڵات جەرگی سوتاوە و کوڕە تاقانەکەی بە نەخۆشی حەیاتی ڕەشیدا و مرد، بۆ دوو سێ مانگ دەچێ، پاشا زاری بەستراوە و قسان ناکات، هەرچی دکتۆر دنیا هەیە، هاتن و نەیانتوانی چارەسەری بکەن، پیری موبارەك چارمان چییە، نازانین چی بکەین؟

پیری موبارەك گوتی:

پاشا بەیەك ڕێگە چاك دەبێتەوە!

ماقولانی شار گوتیان:

بە چ ڕێگەیەك؟

پیری موبارەك گوتی:

گەر سەلیمی جەوهەریی بێتە ئێرە و بەسەرهاتی خۆی بە چەند شەوێك، بۆ پاشا بگێڕێتەوە، پاشا چاك دەبێتەوە!

سەلیمی جەوهەری خەڵکی شاری ئاشکان بوو، زۆر دوور نەبوو لە باڵێلانەوە، لە تەختایی خوار چیاکەدا بوو، نزیك زێی کەڵوێ، ئەو شارە مێژووەکەی نەزانراو بوو، هەندێك لە پیرانی ناوچەکە دەیان گوت:

شاری خواوەند میترایە!

هەندێکی تر لە بەتەمەن و ڕیش سپیەکان دەیان گوت:

شاری پەیامبەر زەردەشتە!

هەرچۆنێك بێت شاری پیاوچاکان و خوداناسان بوو، سەلیمی جەوهەری خەڵکی ئەو شارە بوو.

هەروەها پیاوێکی قسەخۆش و قۆشمە بوو، لە هەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا بەشداربووایە، دەیان بەسەرهات و ڕووداوی ژیانی خۆی دەگێڕایەوە، کە لە لایەکەوە پەند و ئامۆژگاریی بوون بۆ خەڵك، لەلایەکی ترەوە بە جۆرێك لە جۆرەکان پێکەنین و خۆشی دەخستە سەرزاریان یان هەندێك جار فرمێسکی دەخستە سەر چاوانیان. خەڵکی ناوچەکە هەمووان خۆشیان دەویست، بەتایبەتی دەچوون بەدوویدا، بۆ ئەوەی بەسەرهاتیان بۆ وەگێڕێت.

لەسەر قسەی پیری موبارەك، ماقوڵانی شاری باڵێلان، بەدوی سەلیمی جەوهەریدا چوون، بەکورتی بەسەرهاتی پاشای باڵێلانیان بۆ سەلیم باسکرد، پاشان پێیان گوت:

لەسەر داوای پیری موبارەك، داوا لە سەلیم دەکرێت کە بچێت بۆ باڵێلان، بۆ چارەسەری پاشا.

سەلیمی جەوهەری گوتی:

بەسەر چاوان، کارێك بەمن بکرێت بۆ پاشا، دەیان شەو ئامادەم بێمە خزمەتی. بۆیە هەر ئەو ڕۆژە، سەلیم خۆی پێچایەوە و لەگەڵ ماقوڵانی شاردا بۆ باڵێلان وەرێکەوت.

لە ئاشکانەوە تا باڵێلان سەلیمی جەوهەری قسەی خۆشی بۆ ماقوڵان کرد، کاتێك گەیشتنە ناو شاری باڵێلان دەمەو ئێوارە بوو، سەلیمی جەوهەریی خۆی سازکرد و چووە خزمەت پاشا، بەرامبەری دانیشت و گوتی:

گەورەم ئەو بەسەرهاتانەی لەمەودوا بۆتی دەگێڕمەوە، هەمووی ڕاستین، بەسەرهاتی ژیانی منە، بەو شێوەیە دەستی بە قسان کرد و گوتی:

بابم و دایکم لەو کاتەوەی بە حەلاڵی بەیەك گەیشتن و منیان بوو، بەهەژاری و نەداری ژیاین، بۆیە ئەمن کوڕی پیاوێکی حەمباڵ بووم، بابم ڕۆژانە لە بازاڕ کاری حەمباڵی دەکرد، بە پارەکەی من و دایکمی بەخێوکرد، لەبەر ئەوەی پیاوێکی زۆر ئازا و بە توانابوو، لە نێو حەمباڵەکاندا کردیانە باشحەمباڵ[٤].

لەو ڕۆژەوە بابم کاری لە نێو حەمباڵەکاندا دابەشدەکرد، ئێوارە پارەکەی وەردەگرت، پاشان لە حەمباڵەکانی بەشدەکرد و بڕێکیش بۆ خۆی گلدەدایەوە، هەر کارێکیش زۆر گران بووایە، بۆ خۆی دەیکرد، بەو شێوەیە سەروەت و سامانێکی باشی خڕکردەوە.

**(پاشا کە گوێی لەو قسەیە بوو، زەردەیەکی هاتێ[٥]).**

منیش زۆر دەستبلاوبووم، پارە و پوولم زۆر بەم لاو ئەو لادا دەدا. بابم هەمیشە پێی دەگوتم:

ڕۆڵە تۆ نازانی من ئەو پارەیەم چۆن پەیداکردووە، بۆیە ئاوای بە هەدەری دەدەی، ئەو برادەرانەی کە تۆ هەتن، برادەری سەر سفرەن، گەر هیچت نەمێنێ، نایەن بە لاتدا.

بەردەوام ڕۆژانە بابم کاری دەکرد، منیش بە کەیفی خۆم بە هەدەرم دەدا، لەبەر ئەوەی بابم و دایکم تەنیا منیان هەبوو، دەستیان لەبەر دڵیان نەدەبۆوە کە پارەم نەدەنێ، بۆیە چی پەیدا دەکرا، بەشی زۆری دەخورا، زۆر کەمی پاشەکەوت دەکرا.

دوای چەند ساڵێك بابم کەوتە تەمەنەوە، بەهۆی نەخۆشی و دەردی پیرییەوە مرد، ئەو سەروەتە کەمەی کە هەیبوو، هەموویم کردە دەعوەت

---

٤- باشحەمباڵ: سەرۆکی حەماڵەکان، واتە گروپێك حەمباڵ، لە ناو خۆیاندا، کەسێك وەك نوێنەر و چاو ساغی خۆیان هەڵدەبژێرن، بۆ ڕێنوێنی و دابەشکردنی کار.

٥- زەردەیەکی هاتێ: زەردەخەنەیەکی کرد.

و کردم بە ئەوگی[6] برادەرەکانمدا، منیش ئاگام لەوە نییە کە پارە و پوول هەمووی تەواو بووە، ڕۆژێك چەند برادەرێکم لەگەڵ خۆم بردەوە، بە دایکم گوت:

شیو[7] مان بۆ نیوەڕۆ بۆ سازبکە، دایکم گوتی:

بەسەر چاوان، وەکو هەموو جارەکانی دیکە دڵی نەشکانم، کاتی نیوەڕۆ دایکم تەنیا نان و پیوازی لە سەر سفرەکە دانا، برادەرەکانم دایان لە قاقای پێکەنین و ڕۆیشتن.

گوتم:

دایکە تۆ بۆچی واتکرد؟!

دایکم گوتی:

ڕۆڵە لە ماڵی دنیادا، بێجگە لەوەی لە سەر سفرەکە دامناوە، هیچی ترمان نییە! بڕۆ بزانە برادەرەکانت هاوکاریت دەکەن؟

سەلیمی جەوهەری گوتی:

چووم ماڵ بە ماڵی برادەرەکانم گەڕام کە زانیان هیچم نەماوە، هەر یەکەیان بە شێوەیەك خۆیان لێدزیمەوە، ئەو کاتە قسەکانی بابم بیرکەوتەوە کە دەیگوت:

ئەو برادەرانەی کە تۆ هەتن، برادەری سەر سفرەن، گەر هیچت نەمێنێ، نایەن بە لاتدا.

**(ئەم قسانەی سەلیمی جەوهەری پاشای ڕاچڵەکان، فرمێسك بە چاوانیدا هاتەخوار)**

لەبەر ئەوە بەرەو ماڵ بۆ لای دایکم گەڕامەوە.

دایکم گوتی:

---

٦- ئەوگ: ورگ، بین

٧- شیو: خواردن

ڕۆڵە نهێنییەك هەیە، ئێستا وەختییەتی پێتی بڵێم.

سەلیمی جەوهەری گوتی:

نهێنی چی؟

دایکی گوتی:

بابت لە سەرەمەرگدا گوتی:

دەزانم سەلیم دەستبلاوە، ڕۆژێك دێت هیچی نامێنێ، نهێنییەکم لە ژێرزەمینەکەدا بۆ داناوە، بەڵکو کەڵکی لێببینێ.

سەلیمی جەوهەری چووە ژێرزەمینەکە، تەنیا باوەڵێکی کۆنی لێبوو، کردییەوە نامەیەك و کۆپانێکی[8] تێدابوو کە بابی بۆی جێهێشتبوو، لەو نامەیەدا، بابی نووسیبووی:

**(ڕۆڵە سەلیم ئێستا هیچ سەروەتت نەماوە، برادەرەکانیشت بەکەڵکت نەهاتن، تەنیا ڕێگە ئەوەیە کە کۆپانەکە هەڵگرە و بۆ حەمباڵی بچۆرە بازاڕ)!**

سەلیمی جەوهەر بەناچاری کۆپانەکەی کردە کۆڵی و بۆ بازاڕ ڕۆیشت، یەکەم ڕۆژ کەس کاری نەدایە، وەیانزانی گاڵتان دەکات، بە برسیایەتی بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، لە ڕۆژەکانی دیکەوە یەخەی خەڵکی دەگرت بۆ کارکردن، وەك بابی بەهێز و بە توانابوو، بۆیە حەماڵەکان کردیانە باش حەمباڵ، بەهۆی ئەوەوە پارەیەکی باشی خڕکردەوە.

**(بەو قسەیەی سەلیمی جەوهەری، پاشا دڵخۆش بوو، ڕووی گەش بووەوە)**

ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی زستان کاروانێك هات، یەکێك لە وڵاخەکان لە خوار قەڵاتەوە کەوتە نێو قوڕولیتەیەکی زۆرەوە، سەلیمی جەوهەری بارەکەی بە وڵاخەکەوە لە قوڕەکە دەرهێنا، دەمارێکی پشتی سووڕا، بەهۆی

---

٨- کۆپان: دروستکراوێکی کەلەپووری کوردییە، لە پارچە فەرشی کۆن و کا دروستدەکرێت، حەماڵ بۆ باربردن بە کۆڵ، بەکاری دێنێت.

ئـەوەوە مانگێـك لەسـەر جێگەکـەوت، ئـەو پارەیـەی هـەیبوو هـەمووی خوارد.

(بەم قسانەی سەلیمی جەوهەری پاشا غـەمبار بـوو، جـارێکی دی فرمێسـك بـە چاوانیدا هاتەخوار)

## چل ڕۆژ خزمەتت دەکەم، یەك ڕۆژ خزمەتم بکە

دوای ئـەوەی سـەلیم پیشـتی بەخراپی وەرگـەڕا، حـەکیمێك چارەسـەری کرد و پێ گوت:

سەلیم تا مردن نابێت کاری حەمباڵی بکەیت! چونکە بەهۆی پشـتتەوە بەکەڵکی ئەو کارە نەماویت!

سەلیمی جەوهەری وازی لەکاری حەمباڵی هێنا، سەری خۆی هـەڵگرت، چەند دەشت و گرد و چەمی تێپەڕاند، لـە کۆتایـدا ڕووی کـردە شـارێك، شارێکی سەیر بوو! هەر کەسەی شتێکی دەگوت، قسـەی کـەس لـە هـی کەس نەدەچوو، سەلیمی جەوهـەری گـوێی لـە پیاوێك بـوو، بەنێوقـەدی بازاڕدا دەهات و دەیگوت:

کێ دێت چل ڕۆژ خزمەتی دەکەم، یەك ڕۆژ خزمەتم بکات. ئەو قسەیە لە گوێی سەلیمدا زۆری سەیر بوو، قەتی شتی وا نەبیستبوو.

سەلیمی جەوهەری گوتی:

من ئامادەم، چونکە هیچ کارێکم نییە و پارە و پوولیشم نییە.

پیاوەکە سەلیمی جەوهەریی لەگـەڵ خـۆی بـۆ ماڵـەوە بـردەوە، ماڵەکـەی کۆشك و تەلارێك بوو، وەك هی پاشایان، چل ڕۆژ خزمـەتی باشـی کـرد، هـەر چـی ویسـت بـۆی دابینکـرد، سـەلیم لـەو چـل ڕۆژەدا تـەواو بەخۆیداهاتەوە.

دوای چل ڕۆژەکە پیاوەکە دوو ئەسپ و چل گەز گوریسـی هێنـا، لەگـەڵ سەلیمدا سواری ئەسپەکان بوون، بەرەو دەرەوەی شار بەڕێکـەوتن، زۆر

ڕۆیشتن گەیشتنە چۆڵەوانییەك، لە سەر بیرێك لایاندا و کەمێش پشوویاندا.

پیاوەکە گوتی:

سەلیمی جەوهەریی ئێستا بەو گوریسە بۆ نێو ئەو بیرەت شۆڕدەکەمەوە، خوارەوە پڕە لە زێڕ، سێ تورەکە زێڕم بۆ پڕبکە، دووانیان بۆ من و یەکێکیشیان بۆ تۆ، پاشان گوریسەکەی لە نێوقەدی سەلیمی جەوهەری بەست و بۆ نێو بیرەکەی شۆڕکردەوە، تا گەیشتە تەختی بیرەکە.

سەلیم گوتی:

ناو تەختی بیرەکە زۆر گەورە بوو، بەملا و بەولادا ڕووانیم، سەدان ئێسکی سەری مرۆڤی لێبوو، بەشێکی زۆری دیواری بیرەکە پڕ بوو لە زێڕ، لە خوارەوە سێ تورەکە زێڕم پڕکرد و بە گوریسەکە بۆم بەرزکردەوە.

پیاوەکە سێ کیسە زێڕەکەی وەرگرت و وەك پیشەی هەموو جارێکی گوتی:

چیتر کارم پێتنەما، بەجێی هێشت و ڕۆیشت!

**(بەو قسانە پاشا بۆ جارێکی دیکە، فرمێسك بە چاوانیدا هاتەخوار)**

سەلیمی جەوهەری چەند ڕۆژێك بێخواردن و خۆراك لە بیرەکەدا مایەوە، چەند هەوڵیدا نەیتوانی بێتەدەرەوە، بۆیە چیتر توانای نەما و لە هۆشخۆی چوو.

پیری موبارەك بە کونێکدا ڕێوییەکی ناردە نێو بیرەکە، سەلیمی جەوهەری دەستی بە کلکی ڕێوییەکەوە گرت، لە بیرەکەی هێنایەدەر، ئەم جارە لە مردن ڕزگاری بوو.

**(پاشا لە خۆشیدا، دایە قاقای پێکەنین)**

# شەڕی دێوقڕان

دوای ئەوەی سەلیمی جەوهەری لە بیرەکە ڕزگاری بوو، نەیدەزانی کوێوە بچێت، پارەی پێنەبوو، زۆری برسیبوو، جلك و بەرگی هەمووی دڕاو و تۆزاوی بوو، بە ناچاری ملی ڕێگەی گرت و ڕۆیشت، ڕۆژە ڕێیەك ڕۆیشت، لە دوورەوە شارێكی بەدیكرد، ڕۆیشت تا نزیك بووەوە. شارێكی وشك و برنگ، تەڕایی ئاوی تیانەبوو، دار و دەوەنی هەمووی خەریك بوو وشك دەبوو، خەڵكی شار هەموو لە تینوان خەریك بوو دەخنكان، سەلیمی جەوهەری كاتێك گەیشت ناو شار، لە زاركی چەندین ماڵیدا بۆ چۆڕێك ئاو نەبوو، وەختەبوو كوێرایی دابێت. هێزی لێبڕا لە قەرغ شار لە سەر تەندوورێكی كۆن خەوی لێكەوت، لە خەونیدا پیرێژنێكی بینی، بە شاردا دەگەڕا، ڕەشمەی ئەسپێكی بە دەستەوە بوو، شیرێكی تیژی پێبوو، لەگەڵ مەشكەیەك ئاو، دەیگوت:

كێ سەلیمی جەوهەرییە با بێت، تێر ئاوی كەم و بیبەم بۆ شەڕی دێوقڕان، ئەو شەڕە بەس بەو دەكرێ، لەو قسانە وەخەبەرهات[9].

هەستا وردەوردە چووە نێوقەدی شار، هەمان پیرێژنی بینی، ڕەشمەی ئەسپێكی پێبوو، شیرێكی تیژی بە دەستەوە بوو، لەگەڵ مەشكەیەك ئاودا، هاواری دەكرد و دەیگوت:

كێ سەلیمی جەوهەرییە با بێت تێر ئاوی بكەم و بیبەم بۆ شەڕی دێوقڕان.

سەلیمی جەوهەری گوتی:

من ئەوم.

---

٩- وەخەبەرهات: خەبەری بووەوە، لە خەو هەستا.

پیرێژنەکە گوتی:

ئەم شارە تەنیا سەرچاوەیەکی ئاوی هەیە، دێوەکان هاتوون وشکیان کردووە، نایەڵن ئاومان بۆ بێت، ئەگەر تێر ئاو وەخۆیت و سواری ئەم ئەسپە ببیت، ئەو شیرە بە دەستەوە بگریت، دەتوانیت دێوەکان لە ناوبەری.

سەلیمی جەوهەریی گوتی:

بەداواکەت ڕازی دەبم، با جارێ تێر ئاو وەخۆم، خۆمن کوێراییم بۆ تۆزێك ئاو داهات. مەشکە ئاوی نا بەسەرییەوە تێری خواردەوە، پاشان سەلیم سواری ئەسپەکە بوو، شیرەکەی بە دەستەوە گرت، پیرێژن تا نزیك سەرچاوەی ئاوەکەی برد.

سەرچاوەی ئاوی شارەکە، بە تەنگەبەرییەکدا دەڕۆیشت، چەند دێوێك بەبەرد و بەداری گەورە، تەنگەبەرییەکەیان هەڵچنیبوو، ئاوەکە چۆڕەبڕ بووبوو نەدەهات.

پیرێژن خۆی حەشاردا، سالیمی جەوهەریی بە ئەسپ و شمشێری جەوهەردارەوە، خۆی لە دێوەکان ئاشکرا کرد، کاتێك دێوەکا بەو شێوەیە سەلیم یان بینی، ئاوریان هێنا[10]، لەوێ لەگەڵ دێوەکان بە شەڕهات.

هەر سەلیمی جەوهەری هێرشی بۆ دەبردن، دێوەکان تەلیسمیان دەکرد، زەوی تا نێوقەدی قوتدەدا، سەلیمی جەوهەری هێزی لێدەبڕا، لەو کاتانەدا:

**(پاشا دەستی بە گریان دەکرد)**

پیری موبارەك دەهات و تەلیسمەکەی دەشکان، سەلیمی جەوهەری شیرەکەی دادەوەشاند، یەکێك لە دێوەکانی دەکوشت.

---

١٠- ئاوریان هێنا: زۆر تووڕە بوون.

(پاشا لە قاقای پێکەنینی دەدا)

بەو شێویە سەلیمی جەوهەری هەموو دێوەکانی لەناوبرد، بەرد و داری تەنگەبەرایییەکەی داڕووخان، سەرچاوەی ئاوەکە ئازادبوو، ئاو گەیشتە شار، خەڵکی شارەکە لە بێ ئاویی ڕزگاریان بوو، خەڵکی کەوتنە کەیف و خۆشی و سوپاسی سلیمی جەوهەرییان کرد، لەبەر ئەوەی لەو شارە کەسی نەدەناسی، بۆیە شارەکەی جێهێشت و ڕۆیشت.

## زەماوەندی سەلیمی جەوهەری و مەیموون

سەلیمی جەوهەری ڕۆیشت، ڕێگەی کەوتە چیایەکی سەخت، دارستانێکی گەورەی چڕی هەبوو، زۆری برسیبوو، کەوتە خواردنی بەری دارەکان، لەم دار بۆ ئەو دار دەڕۆیشت، دەچووە سەر دارەکان، لە ناکاو تووشی ڕەوە مەیموونێك بوو.

پاشای مەیموونەکان مێچکە بوو، کە سەلیمی جەوهەری بینی جوان بوو، گوتی:

دەبێت مارەم بکەی! دەنا دەتکوژم!

سەلیمی جەوهەری بەناچاری بەداوای مەیموونەکە ڕازیبوو، ئەو ڕۆژە زەماوەندیان سازکرد، مەیموونەکە مێردی بە سەلیمی جەوهەری کرد.

(پاشا فرمێسکی بە چاواندا هاتەخوار)

سەلیمی جەوهەری نزیکەی حەوت ساڵان لەو دارستانەدا مایەوە، لەگەڵ مەیموونەکاندا ژیانی بردەسەر، لەم دار بۆ ئەو دار دەڕۆیشت، جلکی بەبەرەوە نەمابوو، مەیموونە مێچکەکە کە ژنی بوو، بەبەردەوامی چاودێری دەکرد، کوڕ و کچێکی لێی هەبوو، نیوەی لەشیان بۆ سەرەوە ئادەمی بوو، نیوەکەی دیکەی لەشیان بۆ خوارەوە مەیموونی بوو، لەو ماوە زۆرەدا هەوڵیدەدا کە هەڵبێت، بەڵام نەیدەتوانی.

ڕۆژێـک بـیری لـەوەکردەوە کـە چـەند کوندەیـەک پـڕ لـە هـەوا بکـات و کەڵـــەکێکی پێدروســـتبکات، بـــۆ ئـــەوەی لـــە چـــۆمەکەی[11] نزیـــک دارستانەکەوە بتوانێت ڕزگـاری بێـت، بـەنهێنی چـوار کونـدەی پـڕ لـە هـــەواکرد، بـــە دار کەڵـــەکێکی پێدروســـتکرد، پاشـــان کـــوڕ و کچـــە مەیموونەکەی بردە سەر گردێك، لـەوێ جۆلانەیـەکی بـۆ داخسـتن، یـاری جۆلانـەی پێدەکردن، لـە ناکاو گوریسـی جۆلانەکـەی پسـان، یـەکێك لـە منداڵـە مەیموونـەکانی لـە گردەکـەوە گلۆربـوو، هـەموو مەیموونـەکان بەهانایەوە چوون، سالیمی جەوهەری بەرەو چۆمەکە ڕۆیشت، سـواری کەڵەکەکە بوو، بە چۆمەکەدا ڕۆیشت، هەر چەندە مەیوونەکان هەوڵیاندا نەیانتوانی سەلیمی جەوهەری بگرن، چونکە مەلەیان نـەدەزانی، سـەلیم بـەخێرایی ئاراسـتەی کەڵەکـەی دەگـۆڕی و بـەرەو ئەوبـەری چـۆمەکە تاویـدەدا، بۆیـە ڕزگـاری بـوو. لەوبـەر چـۆمەکەوە ملـی ڕێگـەی گـرت و ڕۆیشت.

**(لەو کاتەدا پاشا دایە قاقای پێکەنین)**

---

١١- چۆم: چەم، ڕووبار.

## سـیمرخ[12]

سـەلیمی جەوهـەری دوای ئـەوەی دارسـتانی مەیموونـەکانی بەجێهێشـت، زۆر ڕۆیشـت، گەیشـتە ناوچـەیەکی بـەردەڵانی سـەخت، شارێك بەدیارکەوت، شارەکە هەمووی لەبەرد دروستکرابوو، پێدەچوو شـارێکی زۆر کـۆن بێـت، لەگـەڵ ئـەوەدا شـارێکی چـۆڵ بـوو، سـەلیمی جەوهەریی موچە بە موچە و کوچە بە کوچەی شار گەڕا، کەسی نـەدی، زۆری پێسـەیر بـوو، چـۆن لـەو شـارەدا کـەس دیـار نییـە، مانـدوو بـوو، لەسەر تەندورێك لایدا، و کەمێك پشوویدا، لـە نێـو تەندوورەکەدا گـوێی لە دەنگێك بوو، سەری تەندوورەکەی لادا، پیرێژنێکی بینی.

سەلیمی جەوهەریی گوتی:

هۆ داپیرە ئەوە چ دەکەی لێرەدا؟

پیرێژنەکە گوتی:

لە ترسی مەرگ هاتومەتە ئێرە!

سەلیمی جەوهەری گوتی:

مەرگی چی؟!

ئەدێ[13] ئەو شارە بۆ وا چۆڵە؟

پیرێژنەکە گوتی:

ڕۆڵـە سـیمرخێك پەیـدابووە، زۆر گەورەیـە، هـەموو ڕۆژێك دوای نیـوەڕۆ دێـت، کەسـێك لـەم شـارە هەڵـدەگرێت و دەیبـات، خـەڵکی ئـەم شـارە لـە ترسی ئەو سیمرغە، پـێش نیـوەڕۆ شـارەکە چـۆڵدەکەن و شـەو دێنـەوە، منیش لاقم نین بڕۆم، لە ترسی مەرگ دەچمە ئەم تەندوورەوە.

---

١٢– سیمرخ: باڵدارێکی ئەفسانەییە، لەناو بیر و خەیاڵاتی ئەفسانەیی کوردیدا، توانایەکی لە ڕادە بەدەری هەیە.

١٣–ئەدێ: واتە: ئەرێ، یان ئەی.

سەلیمی جەوهەری گوتی:

بۆچی سیمرغەکە هەموو ڕۆژێك خەڵك دەبات؟

پیرێژنەکە گوتی:

ئەو سیمرغە هێلانەکەی لە سەر دارچنارێکی گەورەیە، ساڵێك دەبێت هەژدیهایەك خۆی لە دارچنارەکە ئالاندووە، هەموو ڕۆژێك دەیەوێت بچێت جووچکەکانی سیمرغەکە بخوات، بەلام سیمرغەکە کەسێك دەبات و دەیخاتە قورگی هەژدیهاکەوە، بەو شێوەیە جووچکەکانی دەپارێزێت.

سەلیمی جەوهەری گوتی:

من دەچم دەیکوژم و هەموو خەڵکی ئەم شارە لە مەرگ ڕزگاردەکەم، بەو ناوەدا چاوی گێڕا، لە سەر تەندوورەکە بیور[14]ێکی تیژی تاودایە[15]، کە بۆ داربڕین دانرابوو، بەرەو دارچنارەکە وەڕێکەوت.

سەلیمی جەوهەریی لە دوورەوە هەژدیهاکەی بینی، کە خۆی لە دارچنارەکە ئالاندبوو، هەژدیهاکە تازە کەسێکی قوتدابوو، بۆ ئەوەی تێکی بشکێنێ، پێشینان دەڵێن: (مار یان هەژدیها کە نێچیر دەخوات، هیچ جووڵەیەکی پێناکرێت، تا تێکی نەشکێنێ)، ئەو کاتە سەلیمی جەوهەری بە هەلی زانی، پەلاماری هەژدیهاکەیدا!

(پاشا چاوانی بۆ سەلیمی جەوهەری پڕ بوون لە ئاو)

دوای ئەوەی سەلیم پەلاماری هەژدیهاکەی دا، بە بیور لەشی پارچە پارچە کرد و گۆشتی لەشی هەژدیهاکەی بە جووچکەکانی سیمرغەکە دا. لە دوورەوە چاوی لێبوو، سیمرغەکە هاتەوە، خێرا لە نێو لق و پۆپی دارەچنارەکەدا خۆی حەشاردا.

---

١٤- بیور: تەور، ئامێرێکی فۆلکلۆریی کوردییە، بۆ بڕینی دار بەکاردێت.

١٥- تاودایە: هەڵگرت.

کاتێك سیمرغ لەسەر کولانەکەی نیشتەوە، سەیریکرد هەژدیهاکە کوژراوە، گۆشتەکەشی بە جووچکەکانی دراوە و تێرووپڕ بوون، گوتی:
گەر بزانم چ کەسێك ئەو کارەی کردووە، چ بڵێ: بۆی دەکەم!
سەلیمی جەوهەری خۆی وەدەرخست و گوتی:
من ئەو کارەم کردووە، لە پاداشتی ئەوەدا سیمرغەکە پەڕەموشێکی لە باڵی کردەوە و گوتی:
هەر کاتێك کارت پێم بوو، ئەو پەڕە موشە بسووتێنە، دەگەمە فریات.

**(پاشا دایە قاقای پێکەنین)**

سەلیمی جەوهەریی بەو شێوەیە خەڵکی شارەکەی لە مردن ڕزگارکرد، خەڵکەکەش لە پاداشتی ئەو چاکەیەدا، سەلیم یان هێنا و ڕێزیان لێنا، یەك مانگ کردیانە کەیف و خۆشی، بەڵام سەلیمی جەوهەریی لەبەر ئەوەی کەسی نەدەناسی، دەستی کورت و هەژار بوو، بەناچاری ئەوێشی جێهێشت و بەرەو ڕێگەیەکی نادیار وەڕێکەوت، خۆشی نەیدەزانی کوێوە دەچێت.

## زیندروو١٦

سەلیمی جەوهەری ڕۆیشت، زۆر ڕۆیشت، لە ڕێگە بیری لەوە کردەوە کە کارێك، پیشەیەك فێربێت باشە، بۆ ئەوەی بژێوی پێدابین بکات، دووربەدوور شارێکی بەدیکرد، شارێکی ئاوەدان و خۆش بوو، چووە ناو شار، لەوێ چەندین قەیسەری و خانێکی گەورەی لێبوو، خۆیکرد بە خانەکەدا، چەندین دووکانی تێدابوو، سەرجەم دووکانەکان، زیندروو بوون، چووە لای وەستایەك و گوتی:

وەستا، دەمەوێ لای تۆ فێری ئەم کارەبم، کابرای زیندووش سەیری سەلیمی جەوهەریی کرد، کوڕێکی گەنجی بەتوانا بوو، گوتی:

زۆر باشە، لەمڕۆوە کاربکە.

سەلیم چەند مانگێك لەگەڵ کابرای زیندروودا کاری کرد، زۆر بەچاکی تونای زیندروستکردنی هەبوو.

ڕۆژێك پاشای ئەو شارە بڕیاریدا و گوتی:

ئەسپێکی جوانم هەیە، هەر کەسێك بتوانێت زینێکی باشم بۆ دروستبکات، کچەکەمی وێدەدەم! هەموو زیندرووەکان کەوتنەخۆ، خەریکی زین دروستکردنبوون، سەلیمی جەوهەریش دەستی بە زین دروستکردنێ کرد. دوای ئەوەی هەموو زیندرووەکان یەکی زینێکیان دروستکرد، لە خانی زیندرووەکاندا، زینەکانیان ڕیزکرد و هەر وەستایەك لە پشتی زینەکەی خۆیەوە وەستابوو.

---

١٦- زیندروو: پیشەیەکی کەلەپووری کوردییە، زین: لەسەر پشتی وڵاخ دادەنرێت، بۆ ئەوەی مرۆڤ بە ئاسوودەیی لەسەر پشتی دانیشێت.

پاشای وڵات هاتە خانەکە و بەڕیز سەیری زینەکانی کرد، لە ناو هەموو زینەکانـدا، پاشـا زینەکـەی سـەلیمی جەوهـەری پـێ جـوانتر بـوو، بڕیارەکەی خۆی بردەسەر و کچەکەی بە سەلیمی جەوهەری دا.

پاشا زەماوەنـدێکی گـەورەی بـۆ کچـەکەی و سـەلیم سـازکرد، تـەواوی خـەڵکی شـار و ناوچـەکەی بـانگکرد، حـەوت شـەو و حـەوت ڕۆژ تەقـەی دەهۆڵ هات و زەماوەند بەردەوام بوو، سەلیمی جەوهەری کەوتە کـەیف و خۆشییەوە.

خۆشـی و شـادی سـەلیمی جەوهـەریی لـە دوو مـانگ زیـاتر تێنەپـەڕی، کچی پاشا تووشی دەردێکی سەخت بوو، هیچ حەکیمێك چاری نـەکرد، بۆیە بەو دەردە حەیاتی ڕەشی دا.

لـەو شـارە نـەریتێك هـەبوو، هـەر کەسـێك کچـی پاشـا بخوازێـت، دواتـر بەهەر هۆیەك کچی پاشا بمرێت، دەبێت مێردەکەشی لەگەڵدا بخەنە نێو گـۆڕەوە، سـەلیم کاتێـك ئـەو نەریتـەی بیسـت، زۆری هەوڵـدا خـۆی قوتاربکات، بـەڵام کـەڵکی نـەبوو، بەو دەسـتوورە سـەلیمی جەوهـەرییان لەگەڵ ژنەکەیدا خستە نێو گۆڕێکەوە.

**(لەو کاتەدا پاشا دایە پرمەی گریان)**

گۆڕەکـە پێکهـاتبوو لـە ژوورێـك لـەناو زەویـدا، لـە هـەموو لایەکـەوە داپۆشـرابوو کـون بـڕ بـوو، سـەلیمی جەوهـەریی دانیشـتبوو بـیری دەکـردەوە، کـە چـۆن ڕزگـاری بێـت، بـیری کـردەوە، پـەڕە موشـەکەی بیرکەوتەوە، دەریهێنا و سووتانی، لە ناکاو سیمرغەکە هـات و سـەلیمی جەوهەریی لە گۆڕەکەدا دەرهێنا، ئەو جارەش لە مردن ڕزگاری بوو.

**(پاشا لە خۆشیدا دایە قاقای پێکەنین)**

## ئەشکەوتی دێو

سەلیمی جەوهەری لە گۆڕەکە ڕزگاری بوو، لە ترسی پاشا و خەڵکی شار، ڕووی کردە چۆڵ و دەشتێك، گەیشتە نێو دارستانێك، یەکێك لە دارەکان دەیگوت:

هۆ کاکی ڕێبوار نەکەی بڕۆیتەپێش، بەو ڕێگەیەدا ئەگەیتە ئەشکەوتێك، دێوێکی لێیە، هەر کەسێك بگرێت، تەلیسمی دەکات و دەیکات بە دار، ئەو شتانەشی پێیەتی لە زێڕ و شتی گران بەها، دێوەکە دەیبات بۆ خەزنەکەی خۆی، ئەو دارانەی تۆ دەیبینی، هەموو مرۆڤی خانەدان و کوڕی پاشان.

سەلیمی جەوهەریی بەهێواشی ڕۆیشت، گەیشتە نێو ئەشکەوتەکە، دێوەکەی بینی لە پاڵ وەجاخەکەدا[17] خەوتبوو، دێو چ دێو، مێچکە دێو بوو، مەمکێکی داخستبوو، مەمکەکەی دیکەی دابوو بە خۆیدا، سامدار سامی لێدەکرد، لەولاشەوە چەند شیشێك گۆشتی دانابوو بیخوات، نوکی شیشەکان لە ئاورەکەدا سوور بووبوونەوە.

سەلیمی جەوهەری دوو شیشی هەڵگرت، لە هەر دوو چاوی دێوەکەی ڕۆکرد[18]، چاوانی کوێرکرد، دێوەکە یەك بە خۆی دەینەڕاند، خۆی لە زەوی وەردەدا[19].

---

١٧- وەجاخ: شوێنی ئاگرکردنەوە.

١٨- ڕۆکرد: پێداچەقاند.

١٩- وەردەدا: دەتلایەوە.

سەلیمی جەوهەریی گوتی:

دەبخۆ دەردت بێت، ئاوات لێدەکەم، لەبەر ئەوەی دێوەکە چاوانی کوێربوون، نەیدەزانی سەلیمی جەوهەریی لە کوێدایە، دێوەکە بەرەو زارکی ئەشکەوتەکە دەڕۆیشت، خۆی لە خۆڵ وەردەدا، ئازاری زۆر بوو، هێند ڕۆیشت لە زارکی ئەشکەوتەکەوە بەرەوخوار گلا، پارچە پارچە بوو، تەلیسمی دێوەکە شکا، هەموو دارەکانی ئەو ناوە بوونەوە بە مرۆڤ و ڕزگاریان بوو.

**(پاشا لە خۆشیدا، دایە قاقای پێکەنین)**

سەلیمی جەوهەریی خەزنەی گەورەی دێوەکەی لە ئەشکەوتەکە دەرهێنا، بەشی زۆری دایەوە بەو کوڕە پاشا و خانەدانانەی کە بووبوونە دار، ئەوەکەی تریشی بە وڵاخێك هێنایەوە بەرەو ئەو شارەی کە یەکەم جار لێوەی هاتبوو، گەیشتەوەماڵەوە، پیرەدایکەکەی لە خەفەتا چاوانی کوێر بووبوو، کە بۆنی سەلیمی جەوهەریی کرد، چاوەکانی چاکبوونەوە. سەلیم بە دایکی شاد بووەوە، لە هەژاری و نەداری ڕزگاری بوو.

بەو شێوەیە هەر کاتێك سەلیمی جەوهەریی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ژیانیدا کە تێکدەشکا، پاشا دەگریا، کە سەریش دەکەوت، پاشا دەیدایە قاقای پێکەنین، بەو ڕێگەیە پاشا چاك بووەوە، توانی بکەوێتەوە قسان. خەڵکی شاری باڵێلان بەچاکبوونەوەی پاشاکەیان خۆشحاڵ بوون، جەژنی بەهاریان بوو بە دوو جەژن. پیری موبارەك دوای تەواوبوونی جەژنی بەهارە، گوتی:

تا بەهارێکی تر و جەژنێکی تر، بەنیازی دیدار، دواتر لەبەر چاوان ون بوو، دیارنەما.

منیش دەڵێم:

**(ئازیزان، دوای گێڕانەوەی ئەم داستانە، کاڵە و پێڵاوم دڕا، هیچم پێنەبرا)**

## شێرۆ

پێشینان دەگێڕنەوە دەڵێن:

شاروخ پاشا زۆر بە دەسەڵات بوو، لە وڵاتدا سووپای گەورەی هەبوو، لە خەزێنەدا سەروەت و سامانی زۆری هەبوو، دوو کوڕی هەبوو، کوڕە گەورەکەی نێو[٢٠]ی شێرۆ بوو، ئەسپ سوارێکی لێهاتوو پاڵەوانێکی بێڕەزا[٢١] بوو، حەزی لە ڕاوشکار و پاك و خاوێنی بوو، لەملانەگرتندا[٢٢] چل کەس پێینەدەوێرا.

کوڕە گچکە[٢٣]کەی نێوی ئارچە بوو، حەزی لە چەتە[٢٤]یی بوو، چل پیاوی هەبوو، شەوانە خەریکی ڕووتکردنەوەی خەڵك بوون.

ڕۆژێك شاروخ پاشا خەڵکی وڵاتی کۆکردەوە و گوتی:

دنیا مان و مردنە، دوای مردنم یەکێك لە کوڕەکانم بەئازادانە هەڵبژێرن و بیکەن بە پاشای وڵات، ڕۆژگار هات و ڕۆی، ساڵ وەرچەرخایەوە، شاروخ پاشا پەکیکەوت و تووشی نەخۆشییەکی سەخت بوو، هیچ حەکیمێك چاری نەکرد، بەو نەخۆشییە کۆچیدوایی کرد.

خەڵکی وڵات بە دەستووری پاشایانە لە گۆڕستانی پاشایان بە خاکیان سپارد، لە وڵاتدا مقۆمقۆی ئەوە پەیدابوو، کە کام کوڕەی پاشا، بکرێ بە پاشای وڵات.

---

٢٠- نێو: ناو.

٢١- بێڕەزا: بەهێز و دەسەڵات، بەتوانا.

٢٢- لەملانەگرتندا: لەزۆرانبازیدا.

٢٣- گچکە: بچووك.

٢٤- چەتە: پیاوخراپ.

خەڵکی بەگشتی دەیان گوت:
شێرۆ کوڕە گەورە بۆ پاشایەتی دەگونجێ، چونکە پاشازادەیە، بەشان و شەوکەتە و ڕاست گۆ و دەستپاکە.
چل چەتەکە دەیان گوت:
ئارچە بۆ پاشایەتی دەگونجێ.
سەرئەنجام خەڵك بڕیاریاندا، شێرۆ ببێتە پاشا، لەسەر تەختی پاشایەتی دایاننا، لەو ڕۆژەوە دەسەڵاتی گرتەدەست، خەریکی بەڕێوەبردنی وڵات بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ وڵات ئاوەدانتر دەبووەوە، خێروبێری زیاتر بەسەردا دەڕژا، خەڵکی وڵات لێی ڕازیبوون، لەولاشەوە ئارچە و چەتەکان خەریکی کاری چەتەیی بوون، دوو ساڵ بەو جۆرە ژیانیان بەسەربرد.
ڕۆژێك ئارچە چەتەکانی کۆکردەوە و گوتی:
شێرۆ دوو ساڵە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە، هەموو سەروەت و سامانی وڵاتی لەبەردەستدایە، هەموو داهات و مڵکی بابم بووە بە هی ئەو، بە ئارەزووی خۆی دەیهێنێ و دەیبا، سبەینێ ژن بخوازێت و منداڵێکی ببێت، دوای خۆی تەواوی دەسەڵات و دارایی و مڵکەکان دەبنە هی کوڕەکەی و منیش لە دارای دنیا هیچم پێنابڕێت، ئەمن ئەوەی بە چەتەیی دەستم نەکەوێ نیمە، کاری چەتەییم تاسەر بۆ ناگونجێ، هەر ڕۆژێك لە کاری چەتەیدا ئاشکرابیم، دەمکوژن یان لانی کەم شاربەدەرم دەکەن، ئەوەی هەمە و نیمە بەخۆشمەوە لەناودەچێت، پێویستە تەکبیرێ بکەم.
ئارچە لەگەڵ چەتەکاندا، زۆری هێنا و برد، گفتوگۆیان زۆر درێژەی کێشا، ئارچە گوتی:

واباشە شێرۆ لەناوبەرم! بۆ ئەوەی ببمە پاشای وڵات، بەشێوەیەك کارەکە ئەنجام بدەین کە کەس نەزانێ منم، تەکبیرەکەی واکرد، بەهەموو ئەملاو ئەولایەك چەتەکانی ڕازیکرد کە لە لەناوبردنی شێرۆ پاشادا تەکبیرکەر و هاوکار و پشت و پەنای بن، بەرامبەر بە لەناوبرد شێرۆ پاشا، ئارچە گوتی:

دەستی چل چەتەکان والآ دەکەم لە کاری چەتەیی، چیشیان دەستکەوت بە نیوەیی، سەرئەنجام بەو تەکبیرە هەموو لایەکیان ڕازی بوون.

### چەتەکان تەکبیر دەکەن شێرۆ لەناوبەرن

سەردەستەی چەتەکان ئارچە بوو، چەندین ماڵ و حەشارگەی گەورەی لەناو شار و دەرەوەی شاردا هەبوو، هەندێکیان لەناو دارستانە چڕەکان و هەندێکیان لەناو چیا سەختەکان و هەندێکیشیان لەناو شار و کۆڵانە تەنگ و تاریکەکاندا، چەتەکان چوونە ناو یەکێ لە حەشارگە نهێنیەکانی ئارچە، کە لە دەرەوەی شاردا بوو، کەوتنە تەکبیرکردن، لەدوای چل شەو گوتیان:

ئارچە تەکبیرمان کردووە.

ئارچە گوتی:

چۆن؟

چەتەکان گوتیان:

ئەتوو[25] هەرۆ[26] بۆ لای شێرۆ و پێی بڵێ:

---

٢٥– ئەتوو: تۆ.

٢٦– هەرۆ: برۆ.

بـۆ ڕاوی چـل شـەوە و چـل ڕۆژە[27] لەگـەڵمان بێـت، قسـەت ناشـکێنێ، چـونکە زۆری حـەز لـە ڕاوشـکارە، بـۆ ڕاو دەچـینە ناوشـاخان، لـەوێ لەئەشکەوتێکدا شێرێکی دڕندە هەیە، بەیانیان کە زەردەیدا[28] دێتەدەر، (ناڵدار لەوێوە بڕوا ناڵی دەپەڕێنێ، باڵدار لەوێوە بفڕێ باڵی دەوەرێنـێ)، شـێرۆ لەبەردەم ڕێبازی ئەشکەوتەکەدا دادەنێین، خۆمان لـە شـوێنی گونجاودا دەشـارینەوە، دەمەوبـەیانی شـێرەکە تێکـی دەشـکێنێ و دەیکـوژێ، بێگومان شێرۆ هەر چەندە پاڵەوان و ئازا بێت، دەرەقەتی شـێر نایـەت، لەو ڕاوەدا شێرۆ پاشا دەمرێ.

دەچینەوە دەڵێین:

لە ڕاو دا شێرۆ پاشا شێر خواردوویەتی، ڕێورەسمێکی بەخاکسپاردنی پاشـایانەی بـۆ سـازدەکەین و لـە گۆڕسـتانی پاشـایان دەینێـژین، لەبـەر ئـەوەی پاشـا جگـە لـە تـۆ هـیچ کـوڕی تـری نییـە، خـەڵکی بەناچـاری دەتکەنـە پاشـا، بـەو شـێوەیە ئارچـە دەچـێتە سـەر تـەختی پاشـایەتی، بەهیچ جۆرێ ئاشکرا نابین، چونکە هیچ کەسێك لەناو شانشینەکەماندا نییە بێت و تاقیبـات لـەو ڕووداوە بکـات و هەوڵبـدا بزانێـت شـێرۆ پاشـا چۆن کوژراوە، بەو جۆرە تەکبیریان کرد.

وەرزی بـەهار بـوو، گوڵاڵـە و شـەوبۆ، چـنوور و شـلێر، بـۆن و ڕەنگـی جوانیان بە باخچە و دەشتودەر بەخشی بوو، سـەرما و سـۆڵەی زسـتان

---

٢٧- ڕاوی چل شەوە و چل ڕۆژە: جۆرێك ڕاوی ئەفسانەییە، کە بە خەون و خەیاڵ لە ناو بەرهەمە ئەفسانەییەکاندا بەرهەم هاتووە، گوایە: پاشا لەگەڵ خزمەتکار و پاڵەوانەکانیدا دەچن بۆ ڕاو، چل شەو درێژە دەکێشێ، پاشا لەو چل شەوەدا، خۆش ڕادەبوێرێت و ئازایەتی و خۆشەویستی خۆی بۆ پیشانی دەوروبەرەکەی دەدات.

٢٨- زەردەیدا: مەبەست لە خۆرهەڵاتنە، ئەو کاتەی کە خۆر دەردەکەوێت و دنیا ڕوون دەبێتەوەی.

کۆتایی هاتبوو، زەمین سەرتاپا سەوز بوو، ئاژەڵەکان زاوزێیان کردبوو، هاژەی چەم و دەنگی باڵندەکان ئاوازێکی خۆشیان دروستکردبوو.

کۆشکی پاشا لەسەر گردێکی بەرز بوو، شورای بە بەرد دروستکراوی پان و گەورە و بەرزی هەبوو، یەك زارکی سفت و قایمی هەبوو، کە لە داری بەڕووار دروستکرابوو، هەزاران سەرباز پاسەوانیان دەکرد.

بە بن قەڵاتدا، دوو زێ دەڕۆیشت، بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایدا، دوو زێی گەورە، زۆر قوڵ و تیژڕەو، لە بەشی باشوری قەڵاوە دوو زێ گەورەکە یەکیان دەگرت و زێیەکی گەورەتریان پێکدەهێنا، تەنیا دەروازەیەك کە هەیبوو، دەکەوتە بەشی باکوورەوە، چونکە لایەکانی دیکەی ئاو بوو.

هیچ مەلەوانێك نەیدەتوانی بەو زێیانەدا وەپەڕێ، لە سەر ئەو دوو زێیە چیرۆك زۆر بوو، زۆر کەس ویستبوویان بە مەلە پێیدا وەپەڕن، گرەویان کردبوو، بەڵام ئاو بردبوونی و لاشەکەشیان نەدۆزرابووەوە، بە تایبەتی ئەو زێیەی کە دەکەوتە بەری ڕۆژهەڵات، هاژە و خوڕەی ترسێنەر بوو.

ناوەوەی قەڵات شارێکی گەورە بوو، هەزاران ماڵی تێدابوو، ماڵی پاشا دەکەوتە نێوقەدی شارەوە، بەرز بوو، بە هەموو لایەکدا دیروانی. با جارێ بچینەوە بۆ لای شێرۆ پاشا بزانین بە داوای چوونە ڕاوی چل شەوە و چل ڕۆژە ڕازی دەبێت؟

ئەگەر ڕازی بێت، ڕووداوەکان بەو ئاکامە دەگات کە ئارچە دەیەوێت، گەر شێرۆ پاشا بەداواکەی ئارچە ڕازی نەبێت، ئەوە پێویستە ئارچە بەشێوەیەکی تر تەکبیر بکات، بۆ ئەوەی شێرۆ لەناوبەرێت، چونکە شێرۆ پاشا لە ناو کۆشکا لەناو نابرێت، کۆشك زۆر قایمە و پاسەوانی زۆرە، پێویستە شێرۆ ببرێتە دەوەوەی کۆشك و شاری دوو زێ.

شێرۆ لە کۆشکی پاشایی دانیشتبوو، ئارچەی برای چوو بۆ لای، گوتی:

سڵاو لە پاشای گەورە.

شێرۆ پاشا گوتی:

سڵاو لە برای ئازیز و خۆشەویستم، بەخێربێیت.

ئارچە گوتی:

ئەوە بۆ دوو ساڵ دەچێت بووی بە پاشا، ئەو هەموو کاتە تەنیا بۆ جارێك بەیەکەوە نەگەڕاوین، ئێستا وەرزی بەهارە، پێم خۆشە بۆ ڕاوی چل شەوە و چل ڕۆژە بچین، چونکە تۆش ماوەیەکە ماندووبووی بۆ ئەوەی کەمێك لەو دەشتودەرە پێکەوەبین، پێت چۆنە؟

شێرۆ پاشا گوتی:

ئێستا پاشای وڵاتم، چونکە ئەرکی بەڕێوەبردنی وڵاتم لەسەرە، پاشای باش پێویستە هەموو کاتێك لەناو خەڵکەکەیدا بێت، بۆ ئەوەی کاروبارەکان بەباشی بەڕێوە بڕوات، لەبەر ئەوەی بۆ ڕاوی چل شەوە و چل ڕۆژە ناتوانم بێم، بەڵام دڵت ناشکێنم دوو سێ ڕۆژ لەگەڵت دێم، دەمێکە بۆ ڕاو نەچووم.

پاشا بڕیاریدا، دوو سێ ڕۆژ بۆ ڕاو بچن، لە کۆشکی پاشا پێویستی ڕاو سازکرا.

ئارچە گوتی:

شێرۆ پاشا پێم خۆشە بەتەنیا بڕۆین، زۆر دەوروبەرمان قەرەباڵغ نەبێت، بۆ ئەوەی لە گەشتەکەماندا ئاسودەبین.

شێرۆ پاشا گوتی:

چۆنت پێ باشە، وادەکەین! بۆ ڕۆژی دوایی بەیانی زوو، شێرۆ پاشا لەگەڵ ئارچەی برایدا، بەرەو ناوشاخان بەڕێکەوتن، بەڵام ئارچە چل چەتەکەی لەگەڵ بوو، دوای نیوە ڕۆژێك بە سواری وڵاخەوە گەیشتنە ناوشاخان.

ناوشاخان چیایەکی بەرز بوو، زۆر سەخت بوو، تەنیا لە سێ جێگەوە مرۆڤ دەیتوانی پێیدا سەربکەوێت، لە خوارەوە بۆ سەرەوە ڕۆژەڕێیەك سەرکەوتن بوو، مرۆڤ شارەزای ڕێ ڕۆیشتن نەبووایە، ون دەبوو، لە تینووان دەخنکا، چونکە چیاکە زۆر بێ ئاو بوو، لە بەشی سەرەوەی چیاکەدا چەند کانییەکی کەم هەبوو، هەموو کەسیش پێینەدەزانی، لوتکەی چیاکە هەمیشە سەربەتەم بوو، پڕ بوو لە بەفر، زستانان کوێستانی سەخت بوو، بۆیە کاروان چییەکان کە هەندێك جار ڕێگەیان بەم چیایەدا بوو، بیرێکی قوڵی گەورەیان لەسەرەڕێگەیەکدای هەڵکەندبوو، جار جار لێیان لادەدا و خۆیان و وڵاخەکانیان تێر ئاو دەکرد.

ئەم چیایە دارستانی گەورەی هەبوو، سەدان جۆر داری بەری تێدابوو، داری زۆر گەورە، کەتەمەنیان بۆ هەزار ساڵ زیاتر دەگەڕایەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی تەنیا لەبەشی دامێنی چیاکەوە دوو گوند هەبوو، ئەویش مەرداربوون، ئیتر کەسی لێنەبوو، بۆیە بووبووە جەنگەڵی ئاژەڵە کێوییەکان، وەك ورچ و پڵەگ و شێر و هتد...

زۆر جار مرۆڤەکان بۆ ڕاو دەچوونە ئەم چیایە، بەڵام هەندێك جار بەخت یاوەریان نەدەبوو، لەلایەن ئاژەڵە دڕندەکانەوە پەلاماردەدران و نەدەگەڕانەوە، مرۆڤ زۆر ئازا و شارەزا نەبووایە ڕاوی پێنەدەکرا.

شێرو پاشا و ئارچەی برای لەگەڵ چەتەکان دەمەونیوەڕۆ گەیشتنە چیای ناوشاخان، لەوێ نزیکی ئەشکەوتێك باریان خست، نانیان خوارد و تا دەمەو ئێواری پشوویاندا.

لــە کــاتی پشــووداندا، چــەتەکان بــە دەورووپشــتی شــێرۆ دا دەهــاتن و دەچــوون، ســەیری شــان و باڵییــان دەکــرد و تێبڕادەمــان و دەترســان، بەنهێنی بەیەکیان دەگوت:

گەر لەگەڵی بیکەین بەشەڕ، بەهەموومان پێی ناوێرینێ.

دەمەو ئێوارێ پێش ئەوەی دنیا تاریك بكات، ئارچە گوتی:

دنیا بەرەو تاریکبوونێ دەچێ، با هەر کەسە بچێتە ڕوانگە[٢٩]ی خۆی و بۆ ڕاوێ ئامادەبێت.

چەتەکان بەپێی ئەو پلانەی کە لەگەڵ ئارچە دایاننابوو، شێرۆ یان بۆ نزیکی ئەشکەوتەکە برد.

گوتیــان: پاشــا ئێــرە ڕوانگــەی تۆیــە، هــەموویان بڵاوەیــان لێکــرد و هەریەکــەیان لــە شــوێنێکی گونجــاودا خۆیــان حەشــاردا، شــێرۆ لــە ڕوانگەکەدا مایەوە.

لە نەریتی کوردەواریدا، ڕاوی بەکۆمەڵ بەوشێوەیەیە کە هەر کەسێك ڕوانگەیــەك بــۆ خــۆی ئامادەدەکــات، بــەپێی ئــەو پلانــەی دایــدەنێن، ڕاوچــییەکان لــە ڕوانگــەی خۆیــدا دادەنیشــێت، بــەو شــێوەیە ڕاو دەستپێدەکات.

بــا بچــینەوە بــۆ لای شــێرۆ پاشــا و چــەتەکان، بــزانین لــە ڕوانگەکــەی خۆیاندا چۆن دەیگوزەرێنن.

چەتەکان هیچیان ڕوانگەیان دروستنەکردبوو، بەپێی پلانەکە هەموویان چووبوونە سەر دارەکان و خۆیان شاردبووەوە، بەڵام شێرۆ پاشا لە نزیك ئەشکەوتێك ڕوانگەیەکی دروستکردبوو، لەوێدا بۆ ڕاو ئامادەبوو، تا بەرەبەیان لە ڕوانگەکەیدا مایەوە.

---

٢٩- ڕوانگە: ئەو شوێنەیە کە ڕاوچی تێیدا خۆی حەشاردەدات، بە کەڵەکی بەرد یان گژوگیا خۆی دادەپۆشێت، لەگەڵ سروشتەکەیا خۆی دەگونجێنێت، ئامادە دەبێت بۆ ڕاو.

بەیانی خۆر زەردەیدا، شێرێك لەو ئەشکەوتە دەرپەڕی[30] و نەڕاندی، کە شێرۆ پاشا ڕوانگەی لەبەردەمیدا دروستکردبوو.

چەتەکان گوێیان لە دەنگی شێرەکە بوو، گوتیان:

ئێستا تێکی دەشکێنێ و دەیخوات، شێرەکە لە بێشەکەی هاتەدەر زۆری برسی بوو، بەرەو ڕووی ڕوانگەکەی شێرۆ پاشا ڕۆیشت، کاتێك لە ڕوانگەکەدا، شێرۆ پاشای بینی، شێرەکە چەپۆکی هەڵبڕی و زار[31]ی داپچڕی، شەڕ دەستی پێکرد، دوو شێر تێکبەربوون.

شێرۆ پاشا مستێکی کاریگەری لە سەری شێرەکە ڕاکێشا، شێرەکە چوارپەلی لەرزی، شێرۆ پاشا شێرەکەی نایەژێرخۆی، هێندەی مست لێدا سست بوو، پاشان بەپشتێنەکەی کەمەری، چوار پەلی شێرەکەی بەست، ئینجا گوێچکەی شێرەکەی گرت و بۆ ئەو شوێنەی هێنا کە باریان لێخستبوو، وردە وردە چەتەکان لە دارەکان هاتنەخوار و لەو شوێنەی باریان لێخستبوو کۆبوونەوە.

شێرۆ پاشا بیری کردەوە لەوەی کە ئازایەتی خۆی پیشانی چەتەکانی ئارچە بدات، بۆیە گوتی:

ئەم شێرەی دەیبینن، لە بێشەکەی بەرەولای ڕوانگەکەی من دەپەڕی، پاشان لەبەر چاوی هەموو چەتەکان بە شیر کوشتی.

ئارچە و چەتەکان کە ئەو ڕووداوەیان بەو شێوەیە بینی، زۆر ترسان لەوەی کە پلانەکەیان هەڵوەشێتەوە و لەو ڕاو و گەشتەدا، نەتوانن شێرۆ پاشا بکوژن، چونکە هەلی وایان بۆ ڕێکنەدەکەوتەوە.

---

٣٠- دەرپەڕی: بەخێرایی هاتەدەر واتە: هاتنەدەری ئاژەڵێك یان شتێك لە کونێك یان ئەشکەوتێك.

٣١- زار: دەم.

شێرۆ پاشا لە بن دارێکدا، شێرەکەی هەڵواسی و خەرکی کەوڵکردنی بوو، بۆ ئەوەی پێستەکەی خۆشبکات، وەکو نموونەی ئازایەتی کە گەڕایەوە بیدا بە شانیدا.

ئارچە لەسەر بەرزییەك لەوبەرەوە دانیشتبوو، چەتەکان دوو دوو سێ سێ بە ناوی نانخواردن و دەست و لاق خاوێنکردنەوەوە دەچوونە لای، ئەویش زۆر لەسەر خۆ بە چەتەکانی دەگوت:

بەهەموومان بە شێرۆ ناوێرین، پێویستە زۆر بەخێرایە تکبیرێکی دیکە[32] بکەین، دوو شەومان لێرە ماوە، هەر چۆنێك بێت، لەم ڕاوە دا شێرۆ لەناوی بەرین.

ئارچە زۆر دڵنیابوو لەوەی کە ئەو تەکبیرەی کە پێشووتر لە شار کردبوویان، شکستی خوارد، تازە شێرۆ پاشا شێرەکەی کوشت، زۆر لەوە ئازاتر بوو، کە ئارچە بیری لێدەکردەوە، لە بیر و خەیاڵی خۆیدا، زۆری دەهێنا و دەبرد، پێویستە ئەمان چ بکەن، چ تەکبیرێك بکەن بۆ ئەوەی شێرۆ لەو گەشتەدا، لە ماوەی دوو ڕۆژدا، لەناوبەرن، بۆ ئەوەی بەمەرامی خۆی بگات و تاجی پاشایی لەسەربنێت، ببێتە خاوەنی سەروەت و سامانی بابی، هەروەها لە چەتەیی ڕزگاری بێت.

---

٣٢- دیکە: تر

## ئارچە چل شەو شێرۆ دەخاتە بیرەوە

لەباسەکەماندا، بابچینەوەی لای چەتەکانی ئارچە، بزانین، ئەم جارەیان چ تەکبیرێك بۆ ئارچە دەکەن، بۆ ئەوەی شێرۆ پاشا لەناوبەرن.
ئـەو ڕۆژە تـا ئێـوارە و شەوەکەشـی تابـەیانی، چـەتەکان نەنووسـتن و بیریان کردەوە و تەکبیریان کرد، بەیانی تاو نەکەوتبوو، گوتیان:
ئارچە تەکبیرمان کردووە.

ئارچە گوتی:
چۆن؟
چەتەکان گوتیان:
شێرۆ پیاوێکی پاك و خاوێنە، هەمیشە پێویست بە ئاو هەیە، چیمان ئاو لایە دەیرێژین، کە داوای ئاوی کرد، دەڵێین:
ئاومان لانەماوە، خۆشتان دەزانن، کە ئەم چیایە وشکە و ئاوی نییە.
لای ئەشـــکەوتی گـــەورە بیرێـــك هەیـــە، ئـــەو بـــیرە چـــل گـــەز قوڵـــە، کاروانچییەکان لە کۆنەوە هەڵیان کەنووە و ئاوی لێدەردەێنن، بیرەکە لـە بەشـی دامێنـی چیاکەدایە، بـە وڵاخ نیـو ڕۆژەڕێ دوورە، دەچینە سـەر بیرەکە، لەوێ بە فیڵ شێرۆ پاشا دەخەینـە نـاو بیرەکـەوە و بـەو شـێوەیە لەناوی دەبەین.
تەکبیرەکە بەو شێوەیەیە کە چووین بـۆ سـەر بیرەکـە، یـەك یـەك سـەیری ناوبیرەکە دەکەین، دەڵێین:
قووڵە بۆ ئاو هەڵهێنجان، ناوێرین بچینە نێـو بیرەکـە، هـەمووومان خۆمـان شـەتەك و مانـدو پیشـاندەدەین، لـەو کاتـەدا، شـێرۆ ویـژدانی ڕازینابـێ

ئێمە تینووبین، بۆ ئاو هەڵهێنجان[٣٣]، دەچێتە نێو بیرەکە، خۆمان و وڵاخەکانمان تێرئاودەکەین، دوایی بۆ سەرەوە هەڵیدەکێشینەوە، لە ناوڕاستی بیرەکەدا، بە شیر گوریسەکە دەپسێنین، شێرۆ دەکەوێتە ناوبیرەکە و نایەتەوەدەر، دوپشك و مار دەیخۆن، پاشان بۆ شار دەگەڕێینەوە و دەڵێین:

لە ڕاو شێرۆ پاشا شێرخواردوویەتی و تێکی شکانووە، ئیتر خەڵکی وڵات بە ناچاری دەتکەنە پاشا.

ئارچە گوتی:

بەنهێنی چی ئاو هەیە بیڕێژن، چەتەکان بەنهێنی چی ئاو هەبوو ڕشتیان.

چێشت هەنگاو شێرۆ گوتی:

پێویستم بە ئاو هەیە؟

چەتەکان گوتیان:

ئاومان لا نەماوە!

شێرۆ گوتی:

چارمان چییە؟

چەتەکان گوتیان:

چیای ناوشاخان ئاوی کەمە، لای ئەشکەوتی گەورە بیرێك هەیە، نیو ڕۆژەڕێ بە وڵاخ دوورە، لەوێ ئاومان چنگدەکەوێت.

شێرۆ بڕیاریدا باروبنە وەپێچن و لە وڵاخەکانی بنێن، بەرە و ئەشکەوتی گەورە وەڕێکەون، بەوشێوەیەی شێرۆ پاشا گوتی:

چەتەکان و ئارچە باروبنەیان پێچایەوە و بە خێرایی لە وڵاخەکانیان نا.

لە ژێڵڵا بەرەو ئەشکەوتی گەورە بەڕێکەوتن.

---

٣٣- هەڵهێنجان: دەرهێنان

دوای نیو ڕۆژەڕێ بە وڵاخ گەیشتنە ئەشکەوتی گەورە و چوونە سەر بیرەکە، بارەکانیان لە وڵاخەکان کردەوە، چەتەکان زۆر ماندوو، تینوو، شەتەك خۆیان پیشاندا، وایان خۆنواند کە هیزیان لێبڕاوە، چەتەکان یەك یەك بۆ سەر بیرەکە چوون و سەیری نێو بیرەکەیان کرد، گوتیان: قووڵە و بۆ ئاو هەڵهێنجان ناوێرین بچینە نێوی.

شێرۆ گوتی:

دەچمە نێو بیرەکە و ئاوتان بۆ هەڵدەهێنجم، گوریسیان لە چوار لاوە لە کەمەری بەست، بە چل چەتەکە شۆڕیان کردەوە بۆ نێو بیرەکە، گەیشتە تەختی بیرەکە و بە کوندە[٣٤] ئاوی بۆ سەر دەخستن، چەتەکان خۆیان و وڵاخەکانیان تێر ئاو کرد و کوندەکانیان بۆ ڕێگا پڕ لە ئاو کرد.

چەتەکان گوتیان:

توند خۆت وەبەستە[٣٥] با هەڵتکێشین، شێرۆ بە گوریسەکان توند خۆی بەستەوە، دەستیان بە هەڵکێشانی کرد، گەیشتە نێوقەدی بیرەکە، ئارچە بە شیر گوریسەکەی پساند[٣٦]، شێرۆ کەوتە ناوبیرەکە و نەیتوانی بێتەوەدەر.

ئارچە کاتێك شێرۆی خستەناو بیرەکەوە، ئیتر کاری خۆی جێبەجێکرد، بە مەرامی دڵی خۆی گەیشت، سوپاسی چەتەکانی کرد.

شێرۆ گوتی:

دەمزانی وام لێدەکەن، ئارچە دەتهەوێ[٣٧] بە فێل ببی بەچی؟

ئارچە گوتی:

---

٣٤- کوندە: لە پێستی مالآت دروستدەکرێت، ئاوی تێدەکرێت.

٣٥- وەبەستە: ببەستەرەوە.

٣٦- پساند: بچڕاند، قرتاند.

٣٧- دەتهەوێ: دەتەوێ.

دەمهەوێ ببم بە پاشا! تۆش با قرژاڵ و مشك بتخۆن.
شیرۆ گوتی:
واز لە پاشایەتی دێنم! لە بیرەکە دەرم بێنەوە، دەمەوێ لە شەڕێکدا بمرم، نەك مشك و قرژاڵ بمخۆن.
ئارچە گوتی:
دەبێ لەو بیرەدا بمری.
شێرۆ گوتی:
هەموو سەروەتی شاروخ پاشات بەتەواوی وێدەدەم، لە وڵاتیش دەڕۆم کەس نەزانی کوێوە دەچم[٣٨].
ئارچە گوێی بە قسەکانی نەدا و جێی هێشت، شیرۆ بەتەنیا لە بیرەکەدا مایەوە، لەبەر ئەوەی زۆر قوڵ بوو، چەندی هەوڵیدا بێتەدەر نەیتوانی، چونکە بیرەکە چل گەز قوڵ بوو، زۆر تاریك بوو، دیواری بیرەکەش زۆر لووس بوو. بۆیە بەو شێوەیە شێرۆ پاشا لە ناو بیرەکەدا گیریخوارد.
با بچینەوە بۆ لای ئارچە و چەتەکان، بزانین کە گەڕانەوە بۆ شاری شاروخ پاشا چ دەکەن.
ئارچە و چەتەکان بۆ شاری شاروخ پاشا گەڕانەوە، لە ڕێگە پشوویەکی باشیاندا، چەند ئاژەڵێکیان ڕاوکرد، پێستی شێرەکەشیان بردەوە بۆ شار، لە دەروازەی شارەوە پێشوازی گەرمیان لێکرا، تا گەیشتنە کۆشکی پاشا.
دوای پشودان وەزیرەکانیان بانگکرد و تەواوی وردەکاری تێکشکانی شێرۆ لە شەڕدا بە دەستی شێر باسکرد، بەجۆرێك سەرجەم وەزیرەکان باوریان بەو چیرۆکە درۆینەیە کرد، پاشان جارچیان بانگکرد، بە وڵاتدا جارِیاندا و گوتیان:

---

٣٨– کوێوە دەچم: بۆ کوێوەدەچم.

شێرۆ لە ڕاوشکار شێر تێکی شکاندووە و خواردوویەتی، هیچ پاڵەوانێك بەو شێرەی نەوێراوە، (باڵدار لەوێوە ڕۆشتبێ باڵی وەراندووە و ناڵدار لەوێوە ڕۆشتبێ ناڵی شکاندووە).

خەڵکی شار ماتەمیان بۆ شێرۆ پاشا گێڕا، زۆر دڵگران بوون بۆی، دوایی بەناچاریی ئارچە یان کردە پاشای وڵات، چونکە شاروخ پاشا جگە لەو کوڕی تری نەبوو.

لەو ڕۆژەوە ئارچە بوو بە پاشای وڵات، سەروەتی بابی بەتەواوی بۆ بەجێما، دەسەڵاتێکی گەورەی هەبوو، سەرەڕای ئەو سەروەت و سامانە، بەمرازی دڵی خۆی گەیشت.

لەولاشەوە چەتەکان بەشەو خەریکی کاری چەتەیی بوو، چەتەکان پوول و پارەیان بە کەسێك شکبردایە، شەو دەچوونە سەری و لێیاندەسەند، بەیانی دەسکەوتەکەیان لەگەڵ پاشا بەنیوەیی دەکرد.

ئاوەدانی خێروخۆشی شاری شاروخ پاشا ڕووی لە کەمی کرد، خەڵك ڕۆژبەڕۆژ هەژار دەبوو، قاتوقڕی کەوتە وڵات، چەندساڵێکی زۆر درێژەی کێشا.

با جارێکی تر بچینەوە لای شێرۆ پاشا، بزانین لە ناو بیرەکەدا چی بەسەرهاتووە، بزانین چۆن ڕزگاری دەبێت!

## شێرۆ خۆی ناودەنێ (دەروێش)

لەبەر ئەوەی چیای نێوشاخان زۆر گەورە بوو، دووره دەست بوو، کاروانچی و ڕاوچی لێدەرچووایە، بەدەگمەون خەڵکی بە پیادەڕێیش، ڕێگەی نەدەکەوتە ئەو چیایە.

شێرۆ لە ناو بیرەکەدا چل شەو مایەوە، زۆری برسی بوو، هێزی لێبڕا، هێندەی قوڕ و لیتەی ناو بیرەکەی چووبووە زارییەوە، زمان و زاری ئەستوور بووبوو[39]، قسەی بۆ نەدەکرا بەئاستەم دەنگی دەردەهات.

بەڕیکەوت دوای چل شەو قەتارێکی[40] بازرگانی بە چیای ناوشاخاندا هات، قەتارە بازرگانییەکە چل کەس بوون، سەرۆکی قەتارچیان[41] شارەزای ناوچەکە بوو، لە تەمەنی لاوێتییەوە خەریکی کاری بازرگانی بوو، لەبەر ئەوەی باریان قورس بوو، ماندووبووبوون و تینویان بوو، لەسەر بیرەکە لایاندا و باریان خست، گوریسیان بۆ ناو بیرەکە داهیڵا[42]، ویستیان ئاو هەڵهێنجن، لە خوارەوە شێرۆ گوریسەکەی گرت، بازرگانەکان لە گوریسەکە نووسان[43]، بۆیان نەهاتەوە سەرەوە، هەموویان سەرسام بوون.

سەرۆکی قەتارچیان گوتی:

لەناو بیرەکەدا شتێکی تیایە گوریسەکەی گرتووە، نایەڵێ ئاو هەڵهێنجین، سەری لە بیرەکە هێنایە پێشەوە و گوتی:

---

٣٩- ئەستوور بوو: ئاوسابوو.

٤٠- قەتار: کاروان.

٤١- سەرۆکی قەتارچیان: سەرۆکی کاروانی بازرگانی.

٤٢- داهیڵا: شۆڕکردەوە.

٤٣- نووسان، تێنووسان: ڕاکێشان.

هۆو هۆو زەلامی، پاڵەوانی، پاشازادەی یان دێوودرنج، بیەڵە ئاو لەم بیرە هەڵهێنجین، ڕێگەیەکی دوورمان بڕیوە و تینومانە، خۆمان و وڵاخەکانمان تێرئاو بین، شەرتبێ دەرت بێنمەوە، دەزانم بە فێڵ لەو بیرە هاوێژراوی[44].

شێرۆ لە ناو بیرەکەدابوو، نەیدەتوانی قسانبکات، بەڵام بەمەرجی سەرۆکی قەتارچیان ڕازی بوو.

شێرۆ بە کوندە ئاوی بە گوریسەکەدا بۆ سەرخستن، بازرگانەکان و وڵاخەکانیان تێرئاوبوون، پاشان گوریسی ئەستوریان بۆ ناو بیرەکە داهێڵا.

بازرگانەکان گوتیان:

تووند لە نێوقەدی[45] خۆتی وەبەستە[46]، بە چل بازرگانە کە ڕایان کێشایە سەرەوە، شێرۆ پاشایان لە بیرەکە هێنایەدەر، پیاوێکی فیلەتەنی زەلام بوو، بە شان و بازوو بوو، هەموویان لێی ترسان، شێرۆ سەرتاپای لەشی قوڕ و لیتە بوو، سەرۆکی قەتارچیان پاك بە ئاو سەر و دەم و چاوی بۆ شوشت[47]، تێر شۆربایان کرد، زاری ئەستور بووبوو، نەیدەتوانی قسانبکات، جلکەکانیان لەبەردا دانا و پاك بۆیان شوشت، پاشان چەند جاجمێکی گەورەیان پیادادا و خەوت.

سێ شەو و سێ ڕۆژ شێرۆ پاشا خەوت، پشوویەکی باشیدا، جەستەی وەکو خۆی لێهاتەوە و هێز و توانای جارانی بۆ گەڕایەوە.

بازرگانەکان گوتیان:

---

٤٤- هاوێژراوی: خراویتەتەناوی.

٤٥- نێوقەد: ناوقەد.

٤٦- وەبەستە: ببەستەرەوە.

٤٧- شوشت: شت.

هەرچەندە ئەو پیاوە ناناسین، بەڵام ئەگەر لەگەڵماندابێت، کەس ناتوانێ بارەکانمان بە تالانبەرێ، پێویستە لەگەڵ خۆمان وەیهێڵین[٤٨].

بەو شێوەیە سێ ڕۆژ قەتار لەسەر بیرەکە مایەوە، پشوویەکی باشیاندا، بەیانی ڕۆژی سێیەم شێرۆ گەرمی بۆوە و هێز و گوڕێکی تێهاتەوە.

سەرۆکی قەتارچیان گوتی:

نێوت چییە؟

شێرۆ وتی:

نێوم دەروێشە، لەگەڵت دەبم تاچاکەت دەدەمەوە، گەر ئەتوو نەبوویتایە مشك و قرژاڵ دەیان خواردم.

سەرۆکی قەتارچیان بڕیاریدا بڕۆن، قەتارچییەکان تا بە دوو سێ یەك بارێکیان لێدەنا، دەروێش بە تەنیا دوو سێ باری لێدەنا، قەتارچییەکان سەریان سووڕما، بەیەکیان دەگوت:

ئەم پاڵەوانە پاشازادەیە، بار لێنرا، قەتار وەڕێکەوت.

سەرۆکی قەتارچیان گوتی:

بەرەو شاری شاروخ پاشا دەڕۆین، دەڵێن:

شاروخ پاشا حەیاتی ڕەشی داوە[٤٩]، زۆر دۆستم بوو، بەسەردان بۆ سەرخۆشی دەچمە لای کوڕەکانی.

شارووخ پاشا باوکی شێرۆ و ئارچە، ئەو کاتانەی کە لە ژیاندابوو، زۆر دەوڵەمەند بوو، هەمیشە هەوڵیدەدا کە کاری بازرگانی ئەنجامبدات، بۆ ئەوەی وڵاتەکەی هەمیشە ئاوەدانبێت، بۆیە بەشی زۆری بازرگانانی

---

٤٨- وەیهێڵین: بیهێڵینەوە.

٤٩- حەیاتی ڕەشی داوە: مردووە، چۆتە دنیای ڕابردووەکان.

دەناسی، لەکاتی مردنەکەشیدا، بەشی زۆری پاشا و خەڵکی شارەکانی تر، بۆ سەرەخۆشی سەردانیان کرد.

## جاریکی دیکە ئارچە هەوڵی کوشتنی شێرۆ دەدا

قەتار لە چیای سەرشاخانەوە بەرەو وڵاتی شاروخ پاشا وەڕێکەوت، کاروانی بازرگانی گەیشتە دەروازەی شار، دەروازەی شاریان بۆ کرایەوە و پێشوازییەکی باشیان لێکردن، تا قەتارچییەکان بارێکیان دەخست، دەروێش دوو سێ باری دەخست. سەرۆکی قەتارچیان گوتی:

ڕاستان کرد، گەر ئەم پاڵەوانەمان لەگەڵ دابێ، چەتە ناتوانێ سەوەت و ماڵمان بەرێ، قەتارچییەکان دەروێشیان لای بارەکان بەجێهێشت، بۆ دیوەخانی ئارچە وەڕێکەوتن.

چەتەکانی ئارچە چاویان لە دەروێش بوو لای بارەکان دانیشتووە، چەند جارێك بەدەوریا هاتن و سەیری شان و بازوویان کرد.

چەتەکان گوتیان:

بەبێ شك ئەمە شێرۆیە، پێش ئەوەی قەتارچییەکان بگەنە دیوەخان، خێرا هەواڵیان بۆ ئارچە برد و گوتیان:

گەورەم پیاوێك لەگەڵ قەتارەکەدا هاتووە، ناوی دەروێشە و لە شێرۆ پاشا دەچێت، بازرگانەکان گەیشتنە دیوەخانی پاشا، لە دیوەخان ئارچە ڕێزی زۆر لێگرتن، چونکە دۆستی بابی بوون.

ئارچە پاشا گوتی:

ئێوە دۆست و هاوەڵی بابم بوون، بۆ شیوی ئێوارێ هەمووتان میوانی ئەمنن.

یەکێ لە چەتەکان گوتی:

گەورەم کەسێکی دیکەشیان لەگەڵە لای بارەکانە، دەچین بەدوای ئەویشدا، بۆ ئەوەی لەنانخواردنەکەدا ئامادەبێت.

ئیتر بازرگانەکان لە ناو کۆشك و تەلاری پاشادا کەوتنە خۆشگوزەرانی و حەوانەوە، لەولاشەوە ئارچە لە دیوێکی نهێنی کۆشکدا، چەتەکانی کۆکردەوە، گوتی:

ئێوارێ لەگەڵ ئەو قەتارەدا پیاوێك دێ، نێوی دەروێشە و لە شیرۆ پاشا دەچێت، گومانیش هەیە کە خۆی بێت، ئێوارێ تاقیدەکەینەوە، لە کاتی نانخواردندا لە لەگەندا[50] شۆربای بۆ تێکەن، ئەگەر دەروێشانە خواردی وازی لێدێنین، ئەگەر پاشایانە خوارد بیکوژن!

هەروەها ئارچە گوتی:

چوار چەتەتان بە شیرەوە لە پشت دەرگاکەوە خۆتان وەشێرن[51]، کە چاوم لێقوچاندن[52] لە دوواوە بیکوژن.

ئێوارە سەرۆکی قەتارچیان بازرگانێکی بە دوی دەروێشدا نارد، بۆ ئەوەی لە نانخواردنی ئێوارێدا بەشداربێ.

دەروێش بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێت، گوتی:

کاکی بازرگان ئێوە بۆ خۆتان نانی بخۆن، ئەمن برسیم نییە، بەو بیانووە لەگەڵی نەچوو. بازرگان بۆ دیوەخان چووەوە گوتی:

دەروێش دەڵێ:

برسیم نییە و نایەم.

سەرۆکی قەتارچیان بۆ خۆی بە دویدا چوو گوتی:

---

٥٠– لەگەن: جۆرێك قاپی گەورەیە.

٥١– وەشێرن: بشارنەوە.

٥٢– لێقوچاندن: لێنووقاندن.

دەروێش پاشا ناردوومی بە دوتدا[٥٣] گەر نەیەیت ئابڕووم دەچێ.

دەروێش گوتی:

باشە لەگەڵت دێم، کاتێ گەشتنە دیوەخان دەروێش لە بەری خوارووەوە نزیکی پێڵاوەکان دانیشت! ئارچە و چەتەکان سەریان سوڕما، لە دڵی خۆیاندا گوتیان:

بڵێی ئەمە شێرۆ پاشا بێت، ئێواریێ سفرە ڕاخرا، نانیان هێنا، یەك لەگەن شۆربای گەورەیان بۆ دەروێش دانا، دەستی بە نان خواردنێ کرد، هەموو سەیری دەروێشیان کرد، ئەویش بەلەپی دەستی شۆربای دەخوارد، نیوەی بە دەست و بەرۆکیدا دەهاتەوەخوار، کە لەگەنەکەی بەنیوەیی کرد، نایبەسەریەوە و هەڵی لووشی، بەشێوەیەکی زۆر دەروێشانە نانی خوارد.

ئارچە باوەڕی نەکرد کەسێکی دیکەبێ، گوتی:

بێگومان شێرۆیە، بڕیاریدا بیکوژێت، بۆیە چاوی لە چوار کەسەکەی پشت دەرگاکەوە قوچاند، کە هاتەدەر لەدواوە بیکوژن، لەم لاشەوە لەسەر سفرە نان بۆ بازرگانەکان دانرا، هەرچی دڵ پێیخۆشبێت لەسەر سفرەکە هەبوو، تێریان خوارد، نان خورا و تا درەنگانی شەو مانەوە، پاشان سەرۆکی قەتارچیان بڕیاریدا بڕۆن، گوتی:

ماڵئاوایی لە پاشای گەورە دەخوازم، دوای ماڵئاوایی لە دیوەخان هاتنەدەر، دەروێش لە دوای هەموویان هاتەدەر، چوار کەسەکە بە شیر و بڕمبەوە بۆیهاتن، پەلاماری دان و هەر چوار پاساوانەکەی بە یەکدادا[٥٤] و هەڵهات[٥٥]. لەبەر ئەوەی ئەو شارە شاری خۆی بوو، زۆر باش شارەزا بوو، شێرۆ بەخێرایی گەیشتە لای قەتارەکە گوتی:

---

٥٣- بەدوتدا: بەدواتدا.

٥٤- بەیەکدادا: بەیەکدا کێشا.

سـەرۆکی قەتارچـیان پاشـا چـوار کەسـی بـۆ ئـەمن دانـابوو بمکـوژن، پـەلامارم دان! خێـرا بـڕۆن! بانـەمانگرن، هـەتا بازرگانـەکان بارێکیـان لێدەنا دەرویێش سێ باری لێدەنا، خێرا قەتار لە شار دەرچوو.

ئارچە گوتی:

ئەو پاڵەوانە شێرۆ بوو!

چەتەکان گوتیان:

بە هەموومان پێیناوێرین، باوازیلێبێنین بڕوات.

بـەو شـێوەیە هـەم شـێرۆ و هـەم قـەتارە بازرگانییەکـە لـە شـاری دووزێ ڕزگاریان بوو، بەوشێوەیە کەوتنەرێ.

## کاروانی بازرگانیی بەرەو شاری (گەورە قەڵات) وەڕێکەوت

قـەتار و کـاروانی بازرگـانی چـەندین گـرد و دەربـەن و چـەمیان بـڕی، پاشان شاخێکی سەختی بەرزیان بڕی و لـە دوورەوە لـە سـەر چیایەکی عاسی و سەخت، شارێك بەدەرکەوت.

دەرویێش لە پێش قەتارەکەوە دەڕۆیشت، زۆر زەلام و زل بوو، گوتی:

ئەم شارە کوێیە؟

سەرۆکی قەتارچیان گوتی:

شاری گەورە قەڵاتە و ئێمە خەڵکی ئەم شارەین.

گـەورە قـەڵات شـارێکی مێـژوویی کـۆنی گـەورە بـوو، لەسـەر شـاخێکی ڕەشی بـەرزی زۆر عاسـی دروسـتکرابوو، بـە هـەر چـواردەوردا هـەزار بـە هـەزار بـوو، شـورای قـایمی لـە بـەرد دروسـتکراوی هـەبوو، دیـواری

---

٥٥- هەڵهات: ڕایکرد.

شوراکان زۆر پان و بەرز بوون، لە ڕۆژهەڵاتی قەڵاوە، تەنیا یەك زارکی هەبوو، کە یەك ئەسپسواری پێدا تێدەپەڕی.
کوردانی ناوچەکە بە بەردی سەخت شوراکەیان دروستکردبوو، زارکی قەڵاتەکەشیان لە داری بەن و مازوو دروستکردبوو. دوژمن بە ئاسانی نەیدەتوانی داگیری بکات.
کاروانی بازرگانی نزیك شاری گەورە قەڵات بووەوە، لە سەربانی حەوت قاتی کۆشکی گەوەر قەڵاتەوە[٥٦]، پاشا و وەزیرەکان دانیشتبوون، خەریکی یاریی نۆڕچکێن[٥٧] بوون، کاروانێکیان بینی بەرەو دەروازەی شار دەهات، فیلەتەنێکی گەورەی زەلام لە پێشی قەتارەکەوە دەهات.
بەهمەنی وەزیر: وەزیری دەستە ڕاستی پاشا بوو، گوتی:
ئەو پاڵەوانە گورگە و لە پێستی مەڕدایە.
خەجووندی وەزیر: وەزیری دەستە چەپی پاشا بوو، گوتی:
ئەوە پاڵەوانە دەروێش نییە.
قاتیلی وەزیر: وەزیری سەربازی پاشا بوو، گوتی:
ئەوە پاشازادەیە.
کاروان گەیشتە دەروازەی شار، پاسەوانەکان دەروازەکەیان کردەوە و کاروان هاتە ناو شار، بە نزیك کۆشکی حەوت قاتی پاشادا تێپەڕی.
کۆشکی پاشا دەکەوتە بەشی سەرەوەی دەروازەی سەرەکی قەڵاتەوە، کۆشکێکی حەوت قاتی گەورە بوو، لە بەرد دروستکرا بوو، سەربانی سەرەوەی گەورە بوو، بەسەر تەواوی قەڵاتدا دەیڕوانی و شاڕێی سەرەکی دەرەوەشی لێوەدیار بوو، هەندێك ڕۆژ پاشا و وەزیرەکان

---

٥٦- قەڵات: قەڵا.

٥٧- نۆڕچکێن نۆڕسکێن، یارییەکی فۆلکلۆریی کوردەوارییە.

لەوێ دادەنیشتن، کاتێك کاروانی بازرگانییەکە لەوێوە ڕۆیشت، پاشا و وەزیرەکان لە شان و بازووی دەروێش سەریان سووڕما، گوتیان:
دەبێت ئەم کەسە کێ بێت؟ حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بیریان کردەوە، بزانن بۆچی هاتووە؟
دەروێش لە ماڵی قەتارچی لایدا و خەریکی خواردن و خواردنەوە بوو.
بەهمەنی وەزیر گوتی:
پاشا تەکبیرێکت بۆ دەکەم.
پاشا گوتی:
چۆن؟
بەهمەنی وەزیر گوتی:
سەرۆکی قەتارچیان بۆ ئێرە بانگدەکەین، پێیدەڵێین:
ئەو فیلەتەنەی لەکوێبووە؟
دوایی لێیدەکڕین.
پاشا چەند سەربازێکی بەدوای قەتارچیدا نارد، دوای کەمێك بۆ کۆشکی حەوت قاتی پاشایان هێنا.
بەهمەنی وەزیر گوتی:
کاکی قەتارچی ئەو فیلەتەنەت لە کوێوە هێناوە؟
قەتارچی گوتی:
لە کاروان هێناندا کڕیومە.
پاشا گوتی:
دەبێ پێم بفرۆشی؟
قەتارچی گوتی:
ئێستا دەچم بۆتی دێنم، سەرۆکی قەتارچیان بۆ ماڵەوە هاتەوە، بە دەروێشی گوت:

پاشـای گـەورە قـەڵات نـاردی بـە دووومـدا، تـوی پێبفرۆشـم، دەسـەڵاتی پاشام نەبوو ناچار ڕازی بووم.

دەروێش گوتی:

لێرەدا چاکەکەت وێدەدەمەوە! چونکە لەناو بیرەکە ئەمنت ڕزگارکرد،

دەروێش بە قەتارچی گوت:

تەکبیرێکت بۆ دەکەم.

قەتارچی گوتی:

تەکبیری چی؟

دەروێش گوتی:

کە چووینە لای پاشا، پێی بڵێ: لە کاتی کاروان هێنان و بردندا، لە شـارێك ئـەم پاڵەوانـەم کڕیـوە و بـە قورسـایی خـۆی زێـڕم[٥٨] پێـداوە، هـەروەها جێگـەی چل کەسـی لـە ئیشـوکاردا بۆ گرتـووم، گـەر زێڕەکـەم وێدەیتەوە[٥٩] پاڵەوانەکەت وێدەدەم[٦٠]!

دەروێش گوتی:

بەو زێڕە هێندەی تر دەوڵەمەند دەبی، دوای تەکبیرکردن بەرەو کۆشکی پاشا وەڕێکەوتن[٦١].

کاتێـك گەیشـتنە بـەر زارکـی کۆشـی پاشـا، پاسـەوانەکان بردنیانـە دیوەخانی کۆشکی حەوت قاتی گەورە قەڵات، لەوێ وەستان، تا پاشا هـات، دوای کـەمێك پاشـا و وەزیرەکـان گەیشـتنە دیوەخـانی گـەورە، قەتارچـی و دەروێـش لـە بەشـی خـوارەوەی دیوەخانەکـە بـە ڕیـزەوە

---

٥٨– زێڕ: ئاڵتوون.

٥٩– وێدەیتەوە: بمدەیتەوە.

٦٠– وێدەدەم: دەتدەمەوە.

٦١– وەڕێکەوت: کەوتەڕێ.

وەستابوون، دوای ئەوەی پاشا و وەزیرەکان لە پێشەوە دەروێشیان بینی، زۆر ترسان و قسەی خۆیان دووبارە کردەوە.

بەهمەنی وەزیر گوتی:

ئەمە گورگە و لە پێست مەڕ دایە.

خەجووندی وەزیر گوتی:

ئەوە پاڵەوانە دەروێش نییە.

قاتیلی وەزیر گوتی:

ئەو پاڵەوانە پاشازادەیە.

پاشا گوتی:

قەتارچی قسان بکە، بزانم ئەم فیلەتەنەت لە کوێ هێناوە؟

قەتارچی گوتی:

پاشای گەورە، لە کاتی کاروان هێنان و بردندا، لە شارێك ئەم پاڵەوانەم کڕیوە، هەروەها جێگەی چل کەسی لە ئیشوکاردا بۆ گرتووم،

پاشا گوتی:

بەچەند پێم دەفرۆشی؟

سەرۆکی قەتارچیان گوتی:

پاشای گەورە، ئەو پاڵەوانە بە قورسایی خۆی زێرم پێداوە، جا نازانم بە ڕێزتان چ دەڵێن.

پاشا بەو سەودایە ڕازی بوو، گوتی:

دەرگای خەزنە وەکەن[٦٢]، بە قورسایی خۆی زێڕی وێدەن[٦٣].

یەکێك لەبەردەستەکانی پاشا تەرازوویەکی گەورەی هێنا، لە دیوەخان داینا، چەند بەردەستێکی تری پاشا، چوون خەزنەی گەورەی پاشایان

٦٢– وەکەن: بیکەنەوە.

٦٣– وێدەن: بیدەنێ.

کردەوە، زێڕ و زیوێکی زۆریان هێنا، پاشان دەروێشیان خستە تایەکی تەرازووەکە و تاکەی دیان پڕ لە زێڕ و زیو کرد، کە هاوسەنگ بوو، زێڕەکەیان لە تێلیسی[٦٤] کرد، سەرۆکی قەتار چیان لەگەڵ خۆی بە ولاخ زێڕەکەی بردەوە، بوو بە دەوڵەمەندێکی گەورەی شاری گەورە قەلآت.
بەو شێوەیە دەروێش چاکەی قەتارچی دایەوە، لەپای ئەوەی کە لە بیرەکە ڕزگاری کرد.
پاشا گوتی: فیلەتەن نێوت چییە؟
شێرۆ گوتی:
دەروێش.
پاشا گوتی:
دەروێش خەڵکی کوێی؟
دوریش گوتی:
گەورەم خەڵکی فلانە گوندم، ناوی گوندێکی دوورە دەستی گوت، پاشا و وەزیرەکانیش نەیان دەزانی کوێیە!
پاشا گوتی:
دەروێش چ کارێك دەزانی؟
دەوریش گوتی:
گەورەم کاری حەمباڵی.
پاشا و وەزیرەکان لەو گفتوگۆیە و بەتایبەت لە قسەکانی دەروێش بەگومان بوون، پاشا فەرمانی کرد دەروێش بەرنەدەر، پاسەوانەکانی دەروێشیان بردەوەدەر، پاشان وەزیرەکان کەوتنە تەکبیرکردن، کە چی لە دەروێش بکەن، بۆ ئەوەی نهێنی هاتنی بۆ گەورە قەلآت ئاشکرا بکەن.

---

٦٤– تێلیس: گوێنی.

دوای تەکبیرکردنێکی زۆر، خەجووندی وەزیر هەڵیدایە و گوتی:
پاشا تەکبیرت بۆ دەکەم.
پاشا گوتی:
چۆن.
خەجووندی وەزیر گوتی:
دەروێشم وێدە، بۆ ماڵەوە دەیبەمەوە، شەو و ڕۆژ دارکاری دەکەم، تا شتێ دەدرکێنێ، ئەوسا لێی حاڵیدەبین چ کارەیە.
پاشا بەو تەکبیرە ڕازیبوو، خەجووندی وەزیر ئەو ڕۆژە دەروێشی بۆ ماڵەوە بردەوە، بەڵام لەگەڵ پاشا ڕاستگۆ نەبوو، لە ماڵەوە لە بری ئەوەی لێیدا، ژوورێکی بۆ تەرخانکرد و خزمەتی باشی کرد، سێ ژەمە خواردن و خواردنەوەی باشی دەدایە!
خەجووندی وەزیر دەیگوت:
ئەمە پاشازادەیە و لە داهاتوودا کەڵکی بۆ ئەمن دەبێ، بۆیە لە ژوورێکی دیکە، دۆشەکێکی لۆکەی دانابوو، شەو و ڕۆژ کەسێکی بۆ بەکرێ گرتبوو دەیکوتا، دراوسێکانی وایان دەزانی دەروێش داکاریدەکەن، ڕۆژانە خەجووندی وەزیر بۆ کۆشکی پاشا دەگەڕایەوە.
پاشا دەیگوت:
چ باسە؟
خەجووندی وەزیر وەڵامی دەدایەوە و دەیگوت:
گەورەم شەو و ڕۆژ بە لیس دارکاری دەکەین، هیچ نادرکێنێ.
شەوانە خەجووندی وەزیر لە داڵانێکی تاریکدا، کە نزیك ژوورەکەی دەروێش، خۆی لێدەگرت، دەیگوت:
بەشکو شتێ بدرکینێ، بەڵام دەروێش هیچی نەدەدرکان.

خەجووندی وەزیر کچێکی جوانی شۆخ و شەنگی هەبوو، ڕۆژێك لە ماڵەوە دەروێشی بینی، دەروێش کوڕێکی گەنجی جوان بوو، کچەکە بەتیری ئەشقی گیرفتار بوو، هەوڵیدەدا خۆی لێ نزیك بکاتەوە، نەیدەزانی چۆن، بەڕۆژ چەند هەوڵیدەدا کەڵکی نەبوو، چونکە دەورویش بەڕۆژ لە ژوورەکەی نەدەهاتەدەر، کە کچەکەشی دەبینی ڕووینەدەدایە.

کچەکەی خەجوندی وەزیر بیری کردەوە کە شەو بچێت بۆ لای دەروێش، بەڵام نەیدەزانی شەوانە باوکی خۆی لێدەگرێ. کچەکەی دوای نانخواردنی ئێواریٚ جلکێکی جوانی لەبەرکرد، خۆی ڕازاندەوە.

شەوی یەکەم: کچەکەی وەزیر بە دالانە تاریکەکەدا تێپەڕی و باوکی نەدی، چوو بۆ لای دەروێش، خەجووندی وەزیر بەباشی ئاگای لەم ڕووداوە بوو، بەهێواشی چووە ژوورەوە، دەروێش وەدەرینا[٦٥].

شەوی دووەم: بەشێوەی شەوی ڕابردوو، کچەکەی وەزیر بە دالانەکەدا تێپەڕی و باوکی نەدی، بەهێواشی چووە ژوور، لەپاڵ دەروێشدا پاڵ کەوت، دەوێش مستێکی[٦٦] لە دەمی ڕاکێشا[٦٧]، دەمی پڕ لە خوێن کرد.

شێرۆ گوتی:

من شێرۆ پاشام، چۆن ناپاکی لە بابت دەکەم، چەند ڕۆژە خواردن و خواردنەوەم دەداتێ وەدەرینا، خەجووندی وەزیر گوێی لەوقسەیە بوو، زۆری پێخۆشبوو، کە کچەکەی لە ژوورکە هاتەدەر، بابی خۆی لێئاشکرا کرد، زۆر ترسا.

---

٦٥- وەدەرینا: کردییەدەرەوە.

٦٦- مستێك: بۆکزێك.

٦٧- ڕاکێشا: پێداکێشا.

خەجووندی وەزیر گوتی:

کچم ئافەرین! نهێنی ئەو پیاوەت بۆ ئەمن ئاشکرا کرد، ئەو شەوە خەجووندی وەزیر کچەکەی بەدەستووری خۆیان لە دەروێش مارەکرد، پاشا و وەزیرەکانی دیکە ئاگاداری ئەم ڕووداوانە نەبوون، ڕۆژی دوایی خەجووندی وەزیر بۆ کۆشکی پاشایی گەڕایەوە.

پاشا گوت:

چ باسە؟

خەجووندی وەزیر گوتی:

بە لیس کوشتومانە نرکەی لێنایە! ئەو بارودۆخە دوو مانگ درێژەی کێشا.

دراوسێکانی خەجووند بۆ لای پاشا چوون، گوتیان:

گەورەم ئەو دەروێشە تاوانی چییە؟ دوو مانگە بە لیس دەیکوتن، خوابەرداری نییە، بەڵکو ئازادیکەی، نەیان دەزانی دۆشەکی لۆکە دەکوتن، پاشا دوودڵ بوو لەو کردەوانەی خەجوندی وەزیر، لەولاشەوە دەروێش تازە زاوا بوو، بە درێژایی ڕۆژ کەیفی دەکرد و ڕایدەبووارد، لەو ماوە کەمەی کە دەروێش لە ماڵی خەجووندی وەزیر بوو، تەواو وەك خۆی لێهاتەوە، لەش و لارێکی بەهێز و بەتوانای بۆ دروستبووەوە.

## بەهمەنی وەزیر نهێنی دەروێش ئاشکرا دەکا

بەهمەنی وەزیر پیاوێکی زیرەك بوو، هەستی بە ڕاستی ڕووداوەکان دەکرد، لە کار و کردەوەی خەجوندی وەزیر بە گومان بوو، بۆیە دەیگوت:

ئەم ماستە بێ موو نییە، چۆن دوو مانگە دەروێش دارکاری دەکەن نرکەی نەکردووە.

بەهمەنی وەزیر چووە لای پاشا و گوتی:

پاشا تەکبیرێکت بۆ دەکەم.

پاشا گوتی:

چۆن؟

بەهمەنی وەزیر گوتی:

دوو مانگە دەروێش لە ماڵی خەجووندی وەزیرە، هیچی لێهەڵنەوەریوە! بۆ ئاشکراکردنی دەروونی دەروێش، بە چەند شێوەیەك تاقیدەکەینەوە:

یەکەم: میوانداریییەك لە دەشتی قەڵات سازدەکەین، هەموو خەڵکی وڵات بانگدەکەین، دەروێش میوانداریی دەکەین، کە نانیان بۆ دانا، بزانین پاشایانە نان دەخوا یان دەروێشانە؟ ئەگەر پاشایانە نانی خوارد، مەرامی دڵی تێدەگەین. ئەگەر بەوە ئاشکرا نەبوو!

دووەم: سەیری هەڵسوکەوت دەکەین، لە کاتی هاتنی بۆ میوانداریییەکە، بزانین دەچێتە[٦٨] نێو پیاوان و پاشایانە دادەنیشێ یان لە نێو منداڵوپاڵدا دادەنیشێ؟ خەریکی ڕەفتاری منداڵانەیە. ئەگەر بەوەش دەرنەکەوت!

سێیەم: کۆتایدا پاڵەوانبازییەکی بە ئەسپ بۆ سازدەکەین، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێ چ کارەیە، گەر بە ڕاستی پاڵەوان بوو، پاڵەوانی خۆمانی بۆ دەنێرین و لەمەیداندا لەناوی دەبەین، گەر پاڵەوانیش نەبوو لێیدەگەڕێین و لە گەورە قەڵات وەدەریدەنێین.

---

٦٨- دەچتە: دەچێتە.

پاشا بە تەکبیرەکەی بەهمەنی وەزیر ڕازی بوو، گوتی:
لە کۆشکی حەوت قاتەوە بە هەموو ولاتدا جاڕبدەن، دوو ڕۆژی دیکە، پاشا لە دەشتی قەلات، میوانداریيەك بۆ خەڵکی ولات بەهۆی هاتنی وەرزی بەهار و جەژنی نەورۆزەوە سازدەکات، هەموو کەس ئامادەبێ، لەو دوو ڕۆژەدا خزمەتکارەکانی کۆشکی پاشا، کەوتنە خۆیان و خواردنێکی زۆریان بۆ ڕۆژی میوانداریيەکە ئامادەکرد.
وەرز بەهار بوو، دەشتودەر سەوز بووبوو، دارەکان تازە چرۆیان کردبوو، کانیاوەکانی دەوروبەر تەقیبوون، گولالە سوورە و گوڵە بەیبوون، تەواوی دەشتەکەیان ڕەنگاندبوو، هەر کەسێکی ئەو دیمەنە جوانە سرووشتییەی دەبینی، دڵی دەکرایەوە، لە ناو ئەو سرووشتیە جوانەدا، لە دەشتی پان و بەرینی قەلاتدا، هەزاران کەس بۆ میوانداریيەکەی پاشا ئامادەبوو.
ئەو دەشتەی کە میوانداریيەکەی تیا سازدەکرا، دەکەتە خوار گەورە قەلاتەوە، هەموو ساڵێك خەڵکی قەلات جەژنی نەورۆزیان لەوێ دەکردەوە، وەك نەریتێکی لێهاتبوو، لە پاڵ دەشتەکەدا گردێکی بەرز هەبوو، پاشا و وەزیرەکان لە بەرزایی گردەکە دادەنیشتن، دەیانڕوانی بەسەر هەموو دەشتەکەدا.
ڕۆژی میوانداریيەکە هەموو خەڵکی شار و گوندەکانی دەوروبەر لەو دەشتە پان و بەرینەدا کۆبوونەوە، دەستیان کرد بەگێڕانی ئاهەنگی خۆشی جەژن، پێش نیوەڕۆ بەهمەنی وەزویر بەتایبەتی پاسەوانێکی ناردی بەدووی دەروێشدا، گوتی:
بە دەروێش بلێ، هەموو خەڵکی ولات ئامادەی میوانداریی و جەژنن، دەبێ ئەویش بێبەش نەبی، پێویستە بێیت.

پاسەوان گەیشتە ئەو ماڵە دەروێشی لێیە، لە زارکەکەی دا، دەروێش زارکی ماڵەکەی کردەوە گوتی:

فەرمانتان بە چییە؟

پاسەوانەکە گوتی:

پاسەوانی بەهمەنی وەزیرم، منی ناردوو بەدوی تۆدا، کە ئامادەی میوانداری و جەژن بیت، بۆ ئەوەی بێبەش نەبی پێویستە بێیت.

دەروێش لە دڵی خۆیدا گوتی:

دەمێکە قەڵەباڵغی و خۆشیم نەدیوە دەچم، لە پەنایەکەوە دادەنیشم، نەبا گومانم بکەنەسەر، دەروێش گوتی:

زۆر باشە ئێستا دێم، خۆی ئامادەکرد و لەگەڵ پاسەوانەکەدا هات، کاتێك گەیشتنە دەشتە پان و بەرینەکە، پاشا و وەزیرەکان سەرنجیان لەسەری بوو، لەباتی بچێتە نێو پیاوان، چووە نێو منداڵوپاڵ[٦٩] و لە پەنایەکدا دانیشت.

نیوەڕۆ وەختی نانخواردن هات، شۆربا تێکرا، خەڵکی بەتێکڕایی وەریان گرت، دەروێش لەگەنێ شۆربای وەرگرت و نایەباوەشی، بە لەپی دەستی دەیخوارد و نیوەی بە سینگ و بەرۆکیدا دەهاتەوەخوار، کە لەگەنەکە بە نیوەیی بوو، نایبەسەریەوە و هەمووی هەڵقوڕان، وەزیرەکان سەیری نانخواردنی دەروێشیان دەکرد، قسەی خۆیان دووبارە دەکردەوە.

بەهمەنی وەزیر گوت:

ئەمە گورگە و لە پێستی مەڕ دایە.

خەجووندی وەزیر گوت:

ئەو پاڵەوانە دەروێش نییە.

---

٦٩- منداڵ وپاڵ: منداڵ و مەزن، منداڵە ورتکە.

قاتیلی وەزیر گوت:

ئەوە پاشازادەیە.

نانخورا و مەیدان بۆ پاڵەوانبازی چۆکرا، یەك یەك پاڵەوانەکان بە سواری ئەسپەوە هاتن، داریان بە دەستەوە بوو، لە سەرێکی مەیدانەکەدا ڕیزبوون و بۆ پاڵەوانبازی ئامادەبوون، چاوەڕێی فەرمانی پاشا بوون.

بەهمەنی وەزیر گوتی:

پاشا وەختی ئەوەیە دەروێش تاقی وەکەین و پاڵەوان بازییەکی پێبکەین، بۆ ئەو مەبەستە ئەسپێکی پەککەوتە و دارێکی خەرای[70] وێدەدەین[71]، بەڵکو لە پاڵەوان بازیەکەدا، پاڵەوانێك بیکوژێ و لە یەقەمان وەبێ[72].

بەهمەنی وەزیر لای دەستەڕاستی پاشاوە دانیشتبوو، هەستایە سەرپێ، و بە ناو خەڵکەکەدا ڕۆیشت، گەشتە لای دەروێش، گوتی:

فیلەتەن ئامادەی پاڵەوان بازییەك لەگەڵ ئەو پاڵەوانانەدا بکەی؟ پاڵەوان بازییەکە بۆ خۆشییە، نەچی بیانکوژی.

دەروێش کە گوێی لە وشەی فیلەتەن بوو زۆری پێناخۆش بوو، بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا[73]، لە دڵی خۆیدا گوتی:

دوو مانگە لە گەورە قەڵاتم، دەخۆم و دەخۆمەوە، لەکەس ناترسم، لەم شارە و لەم مەیدانەدا کەس لەمن ئازاتر و بەتواناتر نییە.

---

٧٠- خەرا: خراپ.

٧١- وێدەدەین: دەیدەینێ.

٧٢- لە یەقەمان وەبێ: لەیەخەمان ببێتەوە، لەکۆڵمان بێتەوە.

٧٣- بەسەر خۆی نەهێنا: گوێی نەدایە.

دەروێش گوتی:

بەڵێ ئامادەم پاڵەوانبازی بکەم!

پاشان بەهەمەنی وەزیر لای دەوێشی بەجێهێشت، هاتە مەیدانەکە و چوو بۆ لای پاڵەوانەکان و گوتی:

ئەو فیلەتەنە بۆ کامتان دابەزی بیکوژن، هەر پاڵەوانێك بیکوژێ خەلاتی دەکەم.

دوای ئەوەی کە وەزیر ڕۆیشت، دەروێش چاوی لێبوو کە چووە مەیدانەکە و لەگەڵ پاڵەوانەکان قسەی کرد، لە مەرامی وەزیر تێگەیشت. دوای کەمێك دەروێش هەستا و بە ناو خەڵکەکەدا تێپەڕی، پاشان چووە سەری مەیدانی پاڵەوانبازییەکە و ڕاوەستا.

خەجوندی وەزیر فەرمانی بەیەکێك لە پاسەوانەکانی کرد، کە ئەسپێکی پەککەوتە و دارێکی خەرا بۆ دەروێش بەرێتە سەری مەیدان و لەوێ ویێدا.

پاسەوانەکەی خەجوندی وەزیر ئەسپێکی پیری پەککەوتە و دارێکی ڕزیوی خەرای بۆ دەروێش برد. دەروێش ئەسپەکەی لێوەرگرت و سەیری کرد، زۆر پەککەوتەیە و گوتی:

با پاڵەوانێتی خۆم یان پیشاندەم، دەستی لەسەر پشتی ئەسپەکە دانا، دایگرد بەرە و زەوی، سکی ئەسپەکە دای لە زەوی، پشتی شکا و تۆپی! پاشا و وەزیرەکان ترسان، لە پاڵەوانێتی دەروێش سەریان سووڕما، خەجوندی وەزیر فەرمانی کرد کە ئەسپێکی باشی بۆ بەرن، پاسەوانە ئەسپەیێکی زۆر باشی بۆ دەروێش برد، دەروێش بەهەمان ڕەفتای دەستی لەسەر پێشتی دانا، تا پشتی شکا و تۆپی، چەند ئەسپی تریان بۆ برد، یەك یەك هەموو یانی بەو شێوەیە تۆپان،

دەروێش بەبێ ئەسپ هاتە مەیدان، پاڵەوانەکان لە ترسا مەیدانیان چۆڵکرد، وەزیرەکان ترسان و پاشای گەورە قەڵات تووڕەبوو.

قاتیلی وەزیر گوتی:

پاشا تەکبیرێکت بۆ دەکەم.

پاشا گوتی:

چییە؟

قاتیلی وەزیر گوتی:

بۆ ئەشکەوتی (بەستەی هەناران)ی دەنێرین، لەوێ (هەژدیها پەیکەر)ی لێیە، تێکی دەشکێنێ، چونکە **(باڵدار لەوێوە ڕۆشتبێ باڵی وەراندووە، ناڵدار لەوێوە ڕۆشتبێ ناڵی پەڕاندووە)**. پاشا ئەو تەکبیرەی پێخۆش بوو.

هەژدیها پەیکەر: ئاژەڵێکی چوارپێی گەورە بوو، کێوی بوو، زۆر بەهێز و بەتوانا بوو، وەکو ئەسپ وابوو، لە ڕۆیشتندا زۆر تیژڕەو بوو، لە مەیدانی ئەسپ سواریدا قەت نەبەزیبوو.

مەمەندی باوکی پاشای گەورە قەڵات لە کاتی گەنجێتیدا، پاڵەوانێکی بێڕەزا بووە، جارێك لە ناوچە چیاییەکانی پشت گەورە قەڵاتدا، بۆ ڕاوشکار چووبوو، لە کاتی ڕاوکردناندا، هەژدیها پەیکەری ڕاوکردبوو، بەجۆرێکی ئەفسانەیی خۆی هەڵدابووە سەر پشتی و لێیخوڕی بوو، هێنابوویەوە بۆ گەورە قەڵات، کە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو.

هەر کەسێك لە هەژدیها پەیکەر نزیك ببوایەتەوە، تێکی دەشکان و دەکوشت، تایبەتمەندییەکی هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کە هەر کەسێك بیتوانیایە بچێتە سەر پشتی، ئەوە هەژدیها پەیکەر بۆی ماڵی دەبوو، بەڵام لە دوای مردنی مەمەندی باوکی پاشای گەورە قەڵات، کەس نەیوێرابوو بچێت بەلایدا.

دەیان ساڵ لە ئەشکەوتی بەستەی هەناراندا بە زنجیری ئاسنیین بەسترابووەوە، لە کولێنکە[٧٤]ی ئەشکەوتەکەوە خواردنی بۆ شۆڕدەکرایەوە، شیر و تیری لە ئەڵماس دروستکراوی مەمەندی، لە پشتی سەری هەژدیها پەیکەرەوە هەڵواسرابوو، ئەشکەوتەکە بە دەرگای پۆڵاین داخرابوو.

## شێرۆ ئەشقی کچی پاشای گەورە قەڵات دەبێت

با جارێکی تر بێینەوە بۆ لای قاتیلی وەزیر، بزانین چۆن دەروێش بۆ لای هەژدیها پەیکەی دەنێرێ، بەمەبەستی کوشتن و لەناوبردنی دەروێش.
دوای ئەوەی دەروێش پشتی چەندین ئەسپی شکاند، قاتیلی وەزیر لەگەڵ چەند پاسەوانێکدا، بۆ لای دەروێش هات و گوتی:
بۆ ئەوەی پاڵەوانبازی تۆمان زیاتر بۆ ڕوونبێتەوە، پێویستە بچیتە ئەشکەوتی بەستەی هەناران، لەوێ لە ژووری ئەشکەوتەکەدا، چوارپێیەکی لێیە (هەژدیها پەیکەر)، بچۆ بیهێنە بۆ مەیدان بۆ پاڵەوان بازیی، چونکە تۆ هەموو ئەسپەکانت تۆپاند، هیچ نەما پاڵەوانبازی پێبکەیت.
چەند پاسەوانێکی لەگەڵ دەروێشدا بۆ بەستەی هەناران نارد، لەوێ لە دوورەوە ئەشکەوتەکەیان پیشانی دەروێشدا و هەموو پاسەوانەکان هەڵهاتن، دەیانزانی کە هەژدیا پەیکەر زۆر دڕندەیە و هەرچی بگرێت لەناوی دەبات، دەروێش بەرەو زارکی ئەشکەوتەکە وەڕێکەوت.

---

٧٤– کولێنکە: هەواکێش.

لەملاوە قاتیلی وەزیر بۆ لای پاشا گەڕایەوە و گوتی:

گەورەم بۆ لای هەژدیها پەیکەرم نارد، کە چووە ژووری ئەشکەوتەکە، تێکی دەشکێنێ و دەیکوژێت، چونکە (باڵدار لەوێوە فڕیبێ باڵی وەراندووە، ناڵدار لەوێوە ڕۆشتبێ ناڵی پەڕاندووە).

قاتیلی وەزیر گوتی:

پاشا جگە لە مەمەندی بابت کەس نەیوێراوە بەلایدا بڕوات، کەسێك وەك بابی ڕەحمەتیت، پاڵەوان نەبێت، ناتوانێت بچێت بەلایدا.

دەروێش لە ئەشکەوتی بەستەی هەناران نزیك بووەوە، ئەشکەوتەکە لە چیایەکی سەختی نزیك گەورە قەڵات بوو، زارکی ئەشکەوتەکە دەکەوتە بەشی دامێنی چیاکەوە، بەردەمی ئەشکەوتەکە چەمێکی گەورە بوو، هەمووی بێشەڵان و چڕی و دار و دەوەن بوو، جێگەیەکی ترسناك بوو، بەڵام دەروێش بۆ هەمیشە بیری لە ترس نەدەکردەوە، چووە پێش بەدەست داروەوەنی بەردەمی زارکی ئەشکەوتەکەی پاکردەوە، دەرگای پۆڵایینی ئەشکەوتەکە دەرکەوت، پاڵی پێوەنا و زارکەکەی کردەوە و چووە ژوور.

لەسەر خۆ چووە ژوورەوە، وردەوردە گوێی لە نەڕەی هەژدیها پەیکەر بوو، چونکە هەژدیها پەیکەر بۆنی زۆر بەهێز بوو، هەستی بە هاتنی کەسێك کرد، بۆیە نەڕاندی.

دەروێش کە هەژدیها پەیکەری بینی و سەیریکرد بە زنجیری ئاسنین بەستراوەتەوە، لەبەر چاوانی زۆر نازدار بوو، چونکە بەتەمەنی چوارپێی وای نەدیبوو، پاشان سەیری پشتی سەری هەژدیها پەیکەری کرد، بینی بە دیواری ئەشکەوتەکەوە، شیر و تیری لە ئەڵماس دروستکراو هەڵواسراوە!

هەژدیها پەیکەر کە دەروێشی بینی نەڕاندی، هەردك[75] چەپۆکی هەڵبڕی لێی ڕاکێشێ، دەروێش خۆی هەڵدایە سەر پشتی و مستێکی لە تەپڵی سەری ڕاکێشا، هەژدیها پەیکەر چوارپەلی لەرزان و چۆکی دادا.
پاشان شیر و تیری لە ئەڵماس دروستکراوی مەمەندی لە خۆی بەست، زنجیری هەژدیها پەیکەری کردەوە و لە ئەشکەوتەکە هێنایەدەر، سەرەتا ڕووی لە شاری گەورە قەڵات پێکرد، گوتی:
بزانم لە کۆڵانان چۆن دەڕوات، دواتر دەیبەمە دەشت، خێرا خێرا تێوەی دەژەن چوارپێ غاریدا، ئەرز و ئاسمانی لەبەر دەلەرزی. هێندەی یەك و دوو گەیشتە شاری گەورە قەڵات.
سەرەتا بە بەردەمی ماڵی کچی پاشای گەوەر قەڵاتدا تێپەڕی، لە سەربانی کۆشکەکەی لەگەڵ خزمەتکارەکانیدا وەستابوو، خەریکی میوە خواردنێ بوو، چاوی لە هەژدیها پەیکەر بوو، بەرە و لای ئەوەوە دەهات، گەنجێکی زۆر قۆزی لەسەر بوو، بە تیری ئەشقی گیرفتار بوو، کچی پاشا سێوێکی لە قاپەکەی بەردەمی هەڵگرتوو هاویشتی، دای بە پشتی دەروێشدا، بە سواری هەژدیها پەیکەرەوە ئاوڕی دایەوە کچی پاشی بینی، لە ژیانیدا ئافرەتی وا جوانی نەدیبوو، بۆیە بە تیری ئەشقی گیرفتار بوو.
کچی پاشای گەورە قەڵات، ئافرەتێکی قەدباریکی باڵا بەرز بوو، پرچێکی درێژی ڕەشی هەبوو، چاوەکانی ڕەش و پێستی سپی و ناسك بوو، لە جوانیدا هاوتای نەبوو، وەکو کورد دەڵێ: (برای خۆی بۆی حەیران بوو)- لەگەڵ ئەمانەدا، ئافرەتێکی خوێندەوار و زیرەك بوو، دەیان کتێبی ناوازەی سەردەمەکەی خوێی خوێندبووەوە، لە کاری درووماندا زۆر باش بوو، چەندین جلکی ناوازەی بۆ خۆی دووریبوو، کە هیچ

---

٧٥– هەردك: هەردوو.

کەسێك نەیدەتوانی بیدروێ. هەموو ئەمانە تایبەتمەندی شازادەبوون، بۆیە ناوبانگی بەتەواوی بەناوچەکەدا بلاوبووبووەوە.

پاشا زۆری خۆش دەویست، چونکە تەنیا ئەو کچەی هەبوو، منداڵی تری نەدەبوو، بۆیە کۆشکی تایبەت بۆ دروستکردبوو، چل پاڵەوان پاساوانیان دەکرد، لە ئامۆزایەکی خۆی مارەکرابوو، جگە لەو کەس بۆی نەبوو بچێتە کۆشکەکەی.

دەروێش بە سواری هەژدیها پەیکەرەوە لە گەورە قەلات هاتەدەر و بەرەو دەشتی قەلات و مەیدانی پاڵەوانبازی ڕۆیشت، لە دەشتی قەلات بوو بە تەپەتەپێکی گەورە، تەپوتۆز هەستا، خەڵکی شار و گوندەکان کە بۆ بەسەر بردنی جەژنێکی خۆش کۆبووبوونەوە، هەموویان ترسان و مەیدان و دەشتەکەیان چۆڵکرد، چونکە هەژدیها پەیکەریان نەدیبوو، تەنیا وەك ئەفسانە بیستبوویان، بۆیە زۆر ترسان.

پاشاو وەزیرەکان هەژدیها پەیکەریان دی سەرسام بوون، پاشا ترسێکی گەورە لە دڵی نیشت، نەیدەزانی چی بکات، بۆیە بە وەزیرەکانی گوت:

تەکبیرتان چییە؟ پێویستە ئێستا ئێمە چی بکەین؟

وەزیرەکان هەریەکەیان کەوتە بیرکردنەوە و کەسیان نەیاندەزانی چی بکەن، بۆیە کەوتنە بیرکردنەوە.

دەروێش لەسەر پشتی هەژدیها پەیکەر بوو، زوو زوو دەستی بە پشت و سەریدا دەهێنا، بۆ ئەوەی زیاتر مالیبکا و لەگەلی ڕابێت، چونکە دەیزانی لەو بارودۆخەدا، تۆشی جەنگێکی باش دەبێت.

### شەڕی دەروێش لەگەڵ قولەی جەنگی

دوای تەکبیرکردنێکی خێرا، قاتیلی وەزیر گوتی:

پاشا یەك ڕێگامان لەبەردەمدا ماوەن کە بتوانین، دەروێش لەناوبەرین و لەیەخەمان وەبێ.

پاشا گوتی:

ئەو ڕێگەیە چییە؟

قاتیلی وەزیر گوتی:

قولەی جەنگی دێنین، بە مستێك دەیکوژێ و لە یەقەمان دەکاتەوە.

قوولەی جەنگی: پاڵەوانی تایبەتی پاشای گەورە قەڵات بوو، زۆر زەلام و زل بوو، لە هەموو پاڵەوانبازیەکاندا، کە لە گەورەقەڵات و تەواوی ناوچەکەدا دەکرا سەرکەوتوو بوو، سامدار سامی لێدەکرد، چواردە ساڵ بوو لە دیوەخان دەیخوارد و دەیخواردەوە، ژەمی مەڕێکی بە مەشکەیە شەرابەوە دەخوارد، کەس نەیدەوێرا پاڵەوانبازی لەگەڵ بکات، هەموو ڕۆژێك دەچووە مەیدان بە تەنیتاقێ یاریی کۆڵەمست و ئەسپ سواری و شمشێربازی دەکرد.

دوای ئەوەی دەروێش هەژدیها پەیکەری لە ئەشکەوتی بەستەی هەنارانەوە بۆ مەیدانی زۆرانبازی هێنا، تەواوی دانیشتوانی قەڵات و دەوروبەری پێسەرسامکرد، قاتیلی وەزیر لەگەڵ پاسەوانەکانیدا، چوو بۆ لای دەروێش.

دەروێش لە سەر پشتی هەژدیها پەیکەر دانیشتبوو، بە ڕێزەوە بەخێرهاتنی وەزیی کرد.

قاتیلی وەزیری گوتی:

دوا بەشی ئاهەنگەکەمان، پاڵەونبازییەکە لە نێوان تۆ و پاڵەوانێکدا، پاشا پێیباشە، دەروێش ئەو پاڵەوانبازییە ئەنجامبدات، بۆخۆشییە دەروێش نەچی پاڵەوانەکە بکوژێت.

قاتیلی وەزیر پاسەوانەکانی بە دوی قولەی جەنگیدا نارد، پاسەوانەکان چوونە گەورە قەڵات بۆ ماڵی قولەی جەنگی، گوتیان:

قولەی جەنگی دەرگای کردەوە و گوتی:

فەرمانتان بەچییە؟

پاسەوانەکان گوتیان:

پاڵەوان، قاتیلی وەزیر بەدوی تۆدا ناردووینی، لە مەیدان کەسێك هەیە، پێویستە پاڵەوانبازی لەگەڵدابکەیت.

قولەی جەنگی زۆر بە خێرایی خۆی ئامادەکرد و خزمەتکارەکانی ئەسپە شێکەیان بۆ زینکرد و لەگەڵ پاسەوانەکاندا بۆ مەیدان ڕۆیشت.

پاسەوانەکان لە ڕیگە پێیان گوت:

ئەو پاڵەوانەی لە مەیدان بۆ ئەتۆ دادەبەزێ بیکوژە، پاڵەوانێتی خۆت بنوێنە، پاشا خەڵاتت دەکات، پاڵەوان بازییەکە دەستی پێکرد، هەموو خەڵکی وڵات بۆ سەیرکردن ئامادەبوون.

پاڵەوانێتیەکە بەپێی دەستورە پاشا بوو، دەبوو دوو پاڵەوانەکە بۆ سەرێکی مەیدان[٧٦] بچن:

پاڵەوانی دووەم بە ئەسپ غاردەدا، پاڵەوانی یەکەم بەدوایدا، تادەگەنە بەردەمی پاشا، لەو کاتەدا گەر توانی پێیبگاتەوە، ئەوە بۆی هەیە بیکوژێ، گەر نەیتوانی، دوو پاڵەوانەکە دەچنەوە سەری مەیدان.

جاری دووەم بە پێچەوانەوە پاڵەوانی یەکەم بە ئەسپ غاردەدا، پاڵەوانی دووەم بەدوایدا، بەو دەستورە پاڵەوانبازیەکە بەردەوام دەبێت.

پاڵەوان بازییەکە دەستی پێکرد، دەروێش بە سواری هەژدیها پەیکەرەوە بوو، قولەی جەنگی بە سواری ئەسپە شێیەکەیەوە[٧٧] بوو، یەکی دارێکیان بە دەستەوە بوو، بۆ پاڵەوانبازی چوونە سەری مەیدان.

---

٧٦–مەیدان: مەبەست لەو جێگەیەیە کە پاڵەوانبازیی تیا ئەنجامدەدرێت.

٧٧– ئەسپە شێ: لە کوردەواریدا ناوی جۆرێکەلە ئەسپ.

جاری یەکەم: **دەروێش بە سواری هەژدیها پەیکەرەوە غاریدا[٧٨]، قولەی جەنگی بە دوایدا هات، چەندی کرد نەیدەگەیشتێ بیکوژێ، چونکە هەژدیها پەیکەر زۆر بە تیژی غاری دەدا، تا گەیشتنە بەردەمی پاشا.**

جاری دووەم: **قولەی جەنگی بە ئەسپە شێکەوە غاریدا، دەروێش بە دوویدا هات، هەژدیها پەیکەر زۆر زوو غاریدا و پێیگەشتەوە، دەروێش دارەکەی لێڕاستکردەوە و لە پشتەوە لێی ڕاکێشا، سەری دارەکە دای لە پشتی قولەی جەنگی، لە سنگیەوە دەرپەڕی، سەری دارەکە دای لە زەوی باوەشێ گڵی لێفرێدا، قولەی جەنگی بە ئەسپە شێکەیەوە لە مەیدانی پاڵەوان بازیەکەدا گلا و بوو بە تەپوتۆزێك چاو چاوی نەدەدی، قولەی جەنگی کوژرا!**

**پاشا و وەزیرەکان زۆریان پێناخۆش بوو، قاتیلی وەزیر بۆ لای دەروێش هات و گوتی:**

**بۆ چی کوشتت؟**

**نەمان گوت:**

**ئەم پاڵەوان بازییە بۆ خۆشییە؟**

**دەروێش گوتی:**

**قوربان دارم بۆ لای ڕاست داوەشاند، بۆ خۆی هاتە بەردەمی، خەتای ئەمن نەبوو، پاشا و وەزیرەکان بەرامبەر دەروێش دەستەوەستان دامان، پاڵەوانبازیەکە کۆتایی پێهێنرا و گەڕانەوە بۆ گەورە قەڵات، خەڵکیش ئەو ناوەی چۆڵکرد.**

**پاشاو وەزیرەکان لە گەورە قەڵات دانیشتبوون، لەبەر ئەوەی دەروێش بەنهێنی زاوای خەجووندی وەزیر بوو، زۆری پێخۆش بوو، هیچی نەدەگوت، پاشا زۆر وەڕسبوون[٧٩].**

---

٧٨-غاریدا: ڕایکرد.

بەهمەنی وەزیر گوتی:

نەمگوت: ئەو فیلە تەنە گورگە و لە پێستی مەردایە.

دەمزانی، هەر لە سەرتای هاتنی بۆ قەلات، خۆی دەرنەدەخست، بینیتان چ پالەوانێکی بێڕەزا بوو، ئەو هەموو ئەسپەی تۆپاند، هەژدیها پەیکەری لە ئەشکەوتی بەستەی هەناران هێنایەدەر، قولەی جەنگی کوشت، دەتوانم بلێم، تووشی کارەساتی گەورەمان دەکات، نازانم بۆچی هاتووە بۆ گەورە قەلات.

پاشا گوتی:

جاریٚ ئەمشەو بۆ مالەوە بڕۆنەوە، پشووبدەن، بەیانی لە کۆشك هەموو یەکتر دەبینین و قسەی زیاتر لەسەر دەکەین.

## پاشای ڕۆژهەلات نامەی هەڕەشە بۆ گەورە قەلات دەنێرێت

بەیانی دوای چێشتەنگاو، لەسەربانی کۆشکی گەورە قەلات، پاشا و وەزیرەکان دانیشتبوون، لە دەوروبەریان دەڕوانی، قسەیان لەسەر دەرویش دەکرد، گوایە چی لێبکەن، لە قەلا وەدەری نێن، یان بیکەن بە پالەوانی گەورە قەلات، یان شتێکی تر.

لە دوورەوە پالەوانێکی گەورەیان بینی، بە سواری ئەسپێکەوە بەرەو دەروازەی شار دەهات، گوتیان:

دەبیٚ ئەو فیلەتەنەی دیکە کێبیٚ؟ بەدەست یەکێکەوە گیرمان خواردووە، نۆرەی دووانە.

پالەوان بە سواری ئەسپەکەیەوە گەیشتە نزیك دەروازەی شار، لەویٚ بە پاسەوانەکانی گوتی:

ناوم (مەنگەنۆسە) نامەی پاشای ڕۆژهەلاتم بۆ پاشای گەورە قەلات هێناوە، پاسەوانەکان دەروازەی گەورە قەلاتیان کردووە، نامەکەیان

٧٩- وەڕسبوون: بێتاقەتبوون.

لێوەرگرت، پاشان بۆ سەربانی گەورە قەڵاتیان هێنا و دایانە دەستی پاشا.

پاشا نامەکەی خوێندەوە، زۆر دڵگران بوو، چونکە سێ داواکاری تێدا بوو، هیچیان شایەنی بیرلێکردنەوە نەبوون، چ جای ئەوەی جێبەجێیان بکەیت، بۆیە زۆر تووڕە بوو، نامەکەی دا بە وەزیرەکان، ئەوانیش خوێندیانەوە! داواکاری ناو نامەکە بەم شێوەیە بوو:

داواکاری یەکەم: پێویستە کچی پاشای گەورە قەڵات، کە لە جوانیدا بێوێنە بوو، بە کەژاوە و کەنیزەکەکانیەوە بۆ پاشای ڕۆژهەڵات بنێردرێ.

داواکاری دووەم: پاشای گەورە قەڵات وڵات چۆڵ بکات، قەڵات بەداتە دەستی پاشای ڕۆژهەڵات.

دواکاری سێیەم: ئەگەر دوو داواکاریەکەی سەرەوە جێبەجێنەکەن، ئەوە بڕیاری شەڕکردن دەدەین، هەر کەسێکیش لە شەڕدا بگیرێ لە ملی دەدرێت و ملك و ماڵی لێزەوت دەکرێت.

لە کۆتایی نامەکەدا نووسرابوو، پێویستە هەر ئەو ڕۆژە، بەپەلە پاشای گەورە قەڵات یەکێك لەو سێ داواکاری هەڵبژێرێت، وەڵامەکەی بە مەنگەنۆسدا بنێرێتەوە.

ئەم نامەیە سەریەشەیەکی گەورەی تووشی پاشا و وەزیرەکان کرد، نەیاندەزانی چی بکەن.

پاشای ڕۆهەڵات: پاشایەکی زۆر بە دەسەڵات و زاڵم بوو، قەڵایەکی گەورە و سەخت و قایمی هەبوو، شورای لەبەرد دروستکراوی زۆر بەرزی هەبوو، سووپای گەورەی بێ ئەژماری هەبوو، سەوەت و سامان و خەزێنەی گەورەی هەبوو، هەواڵی جوانی کچی پاشای گەورە قەڵاتی بیستبوو، دەیویست بە خۆشی بێت یان بە شەڕ بیبا، پاشا باخچەیەکی

گەورەی هەبوو، پڕ بوو لە ژنە جوانەکانی دنیا، سەدان پاڵەوان پاسەوانیان لێدەکرد، زوربەیانی بە شەڕ سەندبوو، ئەو باخچەیە جگە لە خۆی کەس بۆی نەبوو بچێتە نێوی، هەموو پاسەوانەکانی باخچەکەی خەساندبوو، بۆ ئەوەی نەچنە لای ژنەکان.

پاشای ڕۆژهەلات زۆر بەخۆی دەنازی، لەدوای کوشتنی مامی لە گەشتێکدا، کە خۆی چووبووە جێگەی و دەسەلاتی گرتبووە دەست، هەرچی بە مێشکیدا بهاتایە دەیکرد، بەبێگوێدانە ئەنجامەکەی دوایی، لە هیچ جەنگێکیشدا شکستی نەخواردبوو.

با بچینەوە لای پاشای گەورە قەلات، بزانین چ بڕیارێك لەسەر ئەو نامەیە دەدات کە لەلایەن پاشای ڕۆژهەلاتەوە وەك هەڕەشە بۆی هاتبوو:

پاشای گەورە قەلات و وەزیرەکان دوای ئەوەی نامەکەیان خوێندەوە، کۆبوونەوەیەکیان کرد، پاشا بە وەزیرەکانی گوت:

داواکاریەکانی پاشای ڕۆژهەلات زۆر نابەجێیە، گەر کچەکەمی بە کەژاوەکەوە بۆ بنێرم ئابڕوم دەچێ.

خەجووندی وەزیر گوتی:

گەورە قەلات جێگەی باب و باپیرمانە، ناکرێ چۆڵیبکەین.

قاتیلی وەزیر گوتی:

دەبێ شەڕ بکەین، گەر سەرمان تیاچووبێ.

بەهمەنی وەزیر گوتی:

پاشا تەکبیرێکت بۆ دەکەم.

پاشا گوتی:

چۆن؟

بەهەمەنی وەزیر گوتی:

بەدوی دەروێشدا دەنێرین و دەڵێین:

نامەیکمان بۆ هاتووە، نازانین وەیخوێنین[80]!

لە زمانەکەی تێناگەین، وەرە بۆمان وەخوێنە، دوای خوێندنەوەی غیرەت دەیگرێ و شەڕ دەکات، گەر بێت و دەروێش لەگەڵ سوپای پاشای ڕۆژهەلات بەشەڕبێت، بەتەنی تاقی قڕیاندەکات.

پاشا هەندێك لە پاسەوانەکانی بانگکرد و گوتی:

هەر ئێستا بچن دەروێشم بۆ بێێنن. پاسەوانەکان گوتیان:

فرمانتە.

پاسەوانەکانیان بە دوی شێرۆدا نارد.

پاسەوانەکان چوونە لای شێرۆ و گوتیان:

پاڵەوانی گەورە، پاشای گەورە قەلات ناردوینی بە شوێنتا.

دەروێش خێرا خۆی ئامادەکرد و چووە کۆشکی گەورە قەلات.

پاشا گوتی:

دەروێش نامەیەکمان لە پاشای ڕۆژهەلاتەوە بۆ هاتووە، نازانین وەیخوێنیین، بۆمان وەخوێنە.

دەروێش گوتی:

بەسەر چاوان پاشای گەورە.

دەروێش نامەکەی وەرگرت و سێ داواکاریەکەی خوێندەوە، ئاور[81] لە نێو چەوانی دەباری.

دەروێش گوتی:

پاشای گەورە کێ ئەم نامەیەی هێناوە؟

---

٨٠- وەیخوێنین: بیخوێنینەوە.

٨١- ئاور: ئاگر.

پاشا گوتی:

کەسێك بەناوی مەنگەنۆس، هێناویەتی، لە دەروازەی شار ڕاوەستاوە و چاوەڕێی وەلامە.

پاشا گوتی:

ئەوە چی دەڵێ:

ئێمە چ بکەین؟

دەروێش گوتی:

گەر لێم گەڕێن خۆم دەزانم چ دەکەم.

پاشا گوتی:

چ دەکەی ئازاد بە!

دەروێش بەپەلە لە کۆشکی پاشا دەرپەڕی و بەرەو دەروازەی شار ڕۆیشت، کە چاوی بە مەنگەنۆس کەوت، شیرەکەی دەرهێنا و پەلاماری مەنگەنۆسیدا.

مەنگەنۆس پاڵەوانێکی ئازابوو، بەڵام دەرەقەتی دەروێش نەدەهات، کەمێك یەکتریان هێناوبرد، بەڵام دەورێش مەنگەنۆسی دا بەزەویدا و بە شیر دەمولچی بڕی، کردی بەپەندی زەمانە.

دەروێش پێی گوت:

بە پاشای ڕۆژهەلات بڵێ:

پاشای گەورە قەلات شەڕی دەوێ، مەنگەنۆس بە دەمولچی بڕاوەوە بەرەو ولاتی خۆیان گەڕایەوە.

پاشای ڕۆژهەلات لە دوورەوە مەنگەنۆسی بە سواری ئەسپەکەوە بینی، گوتی:

دڵی خۆشە پێدەکەنێ، هەواڵی خۆشی بۆ هێناوم، کە هاتە پێش دەمولچی بڕابوو.

پاشا گوتی:

چ بووە؟

مەنگەنۆس گوتی:

بۆ شاری گەورە قەلات چووم، حالْ و مەسەلەی بۆ گێڕایەوە.

پاشای ڕۆژهەلات گوتی:

سوپای بێئەژمار بۆ شەڕ ئامادەکەن، دەچینە سەریان، کچەکەیان لێدەسەنین، سەریان شۆڕدەکەین، ولاتەکەیان تێکدەدەین.

ڕووداوەکان بەو شێوەیە تێدەپەڕین، دەروێش کە لە بنەچەدا پاشازادە بوو، گەنجێکی جوانی بە شان و شەوکەت بوو، دلْی تەڕ بوو، حەزی دەکرد کەسێك بخوازێت کە خۆشی بوویت، بۆیە لە گەورە قەلات لە بن دارێك دانیشتبوو، کەوتبووە بیری کچی پاشای گەورە قەلات، ئەوکاتە وەبیردەهاتەوە کە سێوەکەی بە پشتیدادا، بڕیاریدا شەو بچێت بۆ لای.

شەو درەنگ بوو، دەروێش لە مالْ هاتەدەر، ڕۆیشت بۆ کۆشکی تایبەتی کچی پاشای گەورە قەلات، کۆشکەکە زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش دروستکرابوو، بەشی پێشەوەی هەمووی گولْ و گولْزار بوو، دەروێش سەیریکرد چل پالْەوان پاسەوانیەتی، بەنهێنی، بە کۆشکەکەدا سەرکەوت، چووە بەردەمی ژووری کچی پاشا، گوێی لێبوو دەیگوت:

ئەو پالْەوانە پاشازادەیە بە تیری ئەشقی گیرفتار بووم، زۆرم خۆشدەوێت، خۆزگە دەبووە هاوسەرم.

دەروێش چووە ژوورەوە، لە نزیکەوە جوانی و شۆخوشەنگی کچی پاشای بینی، توند باوەشیان بەیەکدا کرد، خۆشەویستی و ئەوینی ڕاستەقینەیان گۆڕیەوە، بەو خۆشیەوە بەیەکەوە پالْکەوتن.

ئەو شەوە پاشای ڕۆژهەڵات بە سووپای گەورەوە هات، لە نزیك گەورە قەڵات هەندێ شەڕ و پێکدادان ڕوویدا، دۆست و دوژمن لە یەکی ڕادەکێشا، پاشای گەورە قەڵات دەیگوت:
دەرویش شەڕی بۆناینەوە، کەچی دیار نییە.
ئامۆزای کچی پاشای گەورە قەڵات، پاڵەوانێکە بێرەزا بوو، کچی پاشای لێمارەکرابوو، بەیانی سەرەی پاڵەوانبازی بوو لەگەڵ سووپای دوژمن، گوتی:
ئەم شەو بۆ لای دەسگیرانم دەچم، دنیا مان و مردنە، نەبا بەیانی نەگەڕێمەوە، چوو بۆ کۆشکی کچی پاشا، بەهێواشی چووە سەرەوە، سەیری کرد دەسگیرانەکەی لە باوەشی کەسێك دایە، توونند باوەشیان کردووە بەیەکدا و نووستوون، زۆر تووڕە بوو، شیرەکەی دەرهێنا، لە سەری دەرویشی ڕاکێشا، زۆر بە سەختی زامداریکرد[82]، دەرویش لە هۆشخۆی چوو، کچی پاشای گەورە قەڵات لە خەو ڕاپەڕی، سەیریکرد هەموو ژوورەکە بووە بە خوێن، دەسگیرانەکەی دەرکرد، جوان برینەکەی بۆ دەرویش پێچا، بانگی خزمەتکارەکانی کرد، گوتی:
ئێستا بچن تابووتێك بێنن و ئەم پاڵەوانەی تێکەن، تابووتێکی گەورەیان هێنا و دەرویشیان خستە ناوی، پاشان تورەکەیەك زێڕی خستە لای سەریەوە، گوتی:
ببەن لە دەرەوەی قەڵات داینێن، پیاوچاکێك دەبێت لەبەر خاتری ئەو تورەکە زێرە چاکی بکاتەوە، خزمەتکارەکان تابووتەکەیان برد لە دەرەوە گەورە قەڵات دایاننا، بەنیازی ئەوەی کەسێك بیبات و برینی پاڵەوان چارەسەربکان.

٨٢- زامداریکرد=بریندارێکرد.

## چەتەکانی سێدەر، دەروێش بە برینداری دەبەن

مەمەندی باوکی پاشای گەورە، پاشایەکی توند بوو، لەسەر شتی زۆر بچووك، سزای زۆری خەڵکی دەدا، کەم تا زۆر خەڵکی لێیناڕازیبوون، بەڵام لەبەر ئەوەی پاشا بوو، بەدەسەڵات بوو، خاوەنی سەروەت و سامان و سوپا بوو، خەڵکی نەیدەویرا زۆر بە ئاشکرا دژایەتی بکەن.
یەکێك لە پاڵەوانەکانی شاری گەورە قەڵات، ناوی سێدەر بوو، خاوەنی خزم و قەومێکی زۆر بوو، لەسەر بابەتی مڵکداری، لەگەڵ مەمەندی پاشا، قسەیان لێك هەڵبەزینەوە، ناخۆشی کەوتە نێوانیان.
شەوێك مەمەندی پاشا ویستی لە ناکاو بدات بەسەریدا و بیگرێت، بەڵام سێدەری پاڵەوان زووتر بەو کارەی پاشای زانی، لەگەڵ چل کەس لە خزمان و هاورێیانی ناڕازی لە پاشا، گەورە قەڵایان جێهێشت و چوونە چیا، بۆ ئەوەی لەوێ ژیان بەسەربەرن، لەو ڕۆژەوە لە دەسەڵاتی گەورە قەڵات یاخیبوون.
مەمەندی پاشا ئەو چل کەسەی بە چەتە و ڕێگر و پیاو خراپ ناساندبوو، فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکردبوون، بەڵام تا خۆی لە ژیاندابوو، کەسیانی بۆ نەگیرا، بەڵام بەپێچەوانەوە، لەلایەن خەڵکی گەورە قەڵاتەوە، بە کەسانی باش و بەڕێز دەناسران، چونکە خزم و کەسی یەکبوون، هەروەها زۆر شەو بە نهێنی ڕێگەیان بۆ خۆش دەکرا کەبێنە ناو گەورە قەڵات و بگەڕێنەوە بۆ چیا.
لە سنوری شاری گەورە قەڵات شاخێکی سەخت هەبوو، سێدەر و چل چەتەکەی هاورێی لێبوون، چەتەکان بەهیچ جۆرێك لە قسەی سێدەر دەرنەدەچوون، خۆشیان دەویست و سەریان لە ڕێگەی دادەنا، بەین

بەین بەشەو سێدەر چەتەکانی بۆ ناو شار دەنارد، هەواڵی ناو شاریان بۆ دەهێنایەوە.

شەوێك چەتەکان بە فەرمانی سێدەر، دەڕۆیشتن بۆ ناو گەورە قەڵات، بەڕێکەوت تووشی تابووتەکەی دەروێش بوون، لێی نزیك بوونەوە، یەکێك لەچەتەکان گوتی:

ئەوە تەرمی چ کەسێکە؟

چوونە سەر تابووتەکە و هەڵدایەوە، بینیان پاڵەوانێکی بریندار و توورەکەیەك زێڕی تیایە، گوتیان:

ئەمە بێهۆ نییە، چەتەکان تابووتەکەیان خستە سەرشانیان و بەرەو چیا گەڕانەوە.

گەیشتنەوە شوێنی خۆیان، چەتەیەکیان گوتی:

سێدەر گەورەم بەنیاز بووین، لەسەر فەرمانی تۆ، بۆ ناو شاری گەورە قەڵات بچین، بەڵام لە ڕێگە تووشی ئەم تابووتە بووین، پاڵەوانێکی بریندار و تورەکەیەك زێڕی تیابوو، هەواڵمان لەسەری هەبوو، کە ناوی دەروێشە و پاشازادە، جێگەی چل کەست بۆ دەگرێ. چەتەکان زۆر زانیاری و هەواڵیان لەسەر دەروێش بە سێدەر گوت.

سێدەر کە گوێی لەو قسانە بوو، گوتی:

زۆر باشە، خزمەتی پاڵەوان دەکەین و چاکی دەکەینەوە، بەڵکو لە سایەی ئەوەوە ڕزگارمان بێت و بگەڕێینەوە بۆ ناو گەورە قەڵات.

سێدەر گوتی:

ئێستا بە دوی دکتۆردا هەڕۆن، پێویستە بێت و دەرمانی برینی پاڵەوان بکات، گەر لەگەڵتان نەهات، دەرمانەکان بێنن، خۆمان دەرمانی دەکەین، چەتەکان ئەو شەوە بەخێرایی بۆ شاری گەورە قەڵات هاتنەوە، بەنهێنی

چوونە ماڵی دکتۆر و سڵاوی سێدەریان پێگەیاند، پاشان بە وردی ڕووداوەکەیان بۆ دکتۆر گێڕایەوە، گوتیان:
جەنابی دکتۆر فەرمانت بە چییە، لەگەڵ مان دێیت، لەبەر ئەوەی دکتۆر خزمی سێدەر بوو، پیاوێکی بەڕێز بوو لای، نەیدەتوانی قسەی بشکێنێت، بۆیە دکتۆر تفاقی پێچایەوە و لەگەڵیان هات، هەمان شەو گەشتنە شوێنی خۆیان.
سێدەر کە دکتۆری بینی، بەگەرمی بەخێرهاتنی کرد، پاشان دەروێش یان لە تابووتەکە دەرهێنا، دکتۆر برینەکەی جوان تیمارکرد.
سێدەر گوتی:
دکتۆر دەژی.
دکتۆر گوتی:
پاڵەوان برینەکەی زۆر سەخت نییە، بەڵام زیاتر لە حەوتوویەکی دەوێت بۆ سارێژبوون، زۆر وریای بن.
سێدەر سوپاسی دکتۆری کرد و بەڕێیانکردەوە بۆ گەورە قەڵات، پاشان جاجمیان بە دەروێشدادا، حەوت شەو و حەوت ڕۆژ نووست، هەڵنەستا.
ئەو شەوە، چەتەکانی سێدەر بەنهێنی دکتۆریان بۆ گەورە قەڵات بردەوە، بەسەر سوپای ڕۆژهەڵاتدا کەوتن، ئامادەکاریان دەکرد بۆ هێرشکردنە سەر گەورە قەڵات، بەڵام چەتەکان لەبەر ئەوەی تەواوی ناوچەکە شارەزابوون، خۆیان ئاشکرا نەکرد، دکتۆریان گەیاندەوە شوێنی خۆی و زانیارییان لە سەر سوپای پاشای ڕۆژهەڵات کۆدەکردەوە، کە گەڕانەوە بۆ چیا بۆ لای سێدەر، هەموو هەواڵەکەیان پێدا، سێدەر ئەو ڕۆژە هەموو چەتەکانی کۆکردەوە گفتوگۆیان لەوبارەوەیەوە کرد.

با بچینەوە بۆ لای گەورە قەڵات، بزانین سوپای پاشای ڕۆژهەڵات چ بەڵایەکی بەسەر شارەکەدا هێنا و چ کارەساتێك ڕوویداوە.
دوو ڕۆژ بوو، سوپای ڕۆژهەڵات باروبنەی لە دەشتەکەی نزیك گەورە قەڵاتدا دانابوو، بۆ ڕۆژی سێیەم بە فەرمانی پاشای ڕۆژهەڵات، بەیانی تاریك و لێڵ، هێرشیان کردە سەر گەورە قەڵات.
لە سەرەتاوە شەڕ و پێکدادانی زۆر سەخت ڕوویدا، بە جۆرێك بوو، خوێن سەری دەبرد، هەر هەردوولا کوژراو زۆر بوو. ئەو ڕۆژە تا درەنگانی شەو، شەڕ بەردەوام بوو، سوپای ڕۆژهەڵات بە بەردەوامی سەرباز و پێداویستی جەنگی پێدەگەیشت، بە پێچەوانەوە سوپای گەورە قەڵات، چواردەوری گیرابوو، پێویستی جەنگی و چەك و تفاقی کەم دەبووەوە.
ڕۆژی چوارەم سوپای ڕۆژهەڵات دەروازەی سەرەکی گەورە قەڵاتیان شکاند و توانیان بچنە ناو گەورە قەڵات، ئەوەی شەڕی کرد کوشتیان، دوای نیوەڕۆ دەستیان بەسەر تەواوی گەورە قەڵاتدا گرت، ئەو کارەساتەی نەدەبوو ڕووبدا، ڕوویدا.
با بگەڕێینەوە بۆ چیا، خەبەرێك بزانین، لە دوای حەوت ڕۆژ پشوودان و تیمارکردن، دەروێش هەستایەوە، وەك خۆی لێهاتبووەوە، گوتی:
ئێرە کوێیە؟
سێدەر گوتی:
ئێرە چیایە، ئێمە کەسانی یاخین لە گەورە قەڵات، بە کورتی بەسەرهاتی هاتنی دەروێش بۆ چیا بۆ گێڕایەوە.
دەروێش گوتی:

گەر ئێوە نەبوونایە دەمردم، چاکەتان وێدەدەمەوە، داوای ئاوی کرد، ئاو یان بۆ هێنا پاك خۆی شۆرد، چونکە زۆری حەز لە پاك و خاوێنی بوو.

شێرۆ سەیری چیاکە و دەوروبەری کرد، زۆر دڵگیر و خۆش بوو، گوتی:

دەمێکە نەگەڕاوم، ئەمڕۆ بۆ ڕاو دەچم، تیروکەوانەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت، لە ڕوانگەیەکدا بۆ ڕاو دانیشت، دوو تاژی بینی، کەروێشکێك یان ڕاودەنا، کەوتەسەریان کەروێشکەکەی بە تۆپزی[٨٣] لە دوو تاژییەکە سەند و کەوڵیکرد.

لە ناکاو ڕاوچییەك هات گوتی:

ئەو دوو تاژییە هی ئەمن بوو، کەروێشکەکە یان ڕاو نا، دەبێ وێمدەیەوە.

دەروێش گوتی:

لە ڕاودا دەستور وایە، کێ زوو نێچیری گرت هی خۆیەتی، بوو بە دەمەبۆڵەیان و پەلاماری یەکیاندا، دەروێش ڕاوچییەکەی نایە ژێر، شیرەکەی دەرهێنا.

ڕاوچی گوتی:

ئاخ!

دەروێش گوتی:

بۆ دەڵێی ئاخ؟

---

٨٣– بەتۆپزی: بەزۆر.

ڕاوچی گوتی:

لێرە دەمکوژی، کەس نازانێ کێ کوشتومی؟ لاشەم مشك و مار دەیخۆن، گوتی:

کوڕی گەورەی خێڵێکی کۆچەریم، بیکە بە خاتری باوکم مەمکوژە.

دەرویش شیرەکەی لا برد و نەیکوشت.

ڕاوچی هەستایەوە گوتی:

مادەم منت نەکوشت، بەیانی لای بابم میوانداریت دەکەم وەرە.

دەرویش کەرویشکەکەی هەڵگرت و بۆ لای سێدەر گەڕایەوە، دووقۆڵی بەیەکەوە خواردیان.

دەرویش گوتی:

ئەمڕۆ لە ڕاو تووشی ڕوداوێك بووم، حاڵ و مەسەلەی بۆ گێڕایەوە، گوتی:

بەیانی لای خێلی کۆچەریی میوانداری کراوین، هەموومان دەچین نەوەك تۆڵەمان لێبکەنەوە، چەتەکان با لە دەرەوە دانیشن، ئێمە لە ژوورەوە دەبین، گەر پەلاماریان داین دەست بوەشێنن.

لەولاوە ڕاوچی بۆ لای بابی گەڕایەوە گوتی:

بابە ئەمڕۆ لە ڕاو تووشی پاڵەوانێك بووم، لەسەر کەرویشکێك لێمان بوو بە شەڕ، خەریك بوو بە شیر بمکوژێتەوە، کردمی بەخاتری ئەتوو، بەیانی پێم وتووە میوانداری دەکەم، بۆ ئێرە دێت.

ڕاوچی گوتی:

بابە ئەو پاڵەوانە پاشازادەیە، گەر خزمایەتی لەگەڵ دروستبکەین، لە داهاتوودا کەڵکی لێوەردەگرین، لەبەر ئەوە کچێکی لە خێڵەکە دەدەینێ.

ڕۆژی دوایی سێدەر و دەروێش بۆ میوانداری خێڵی کۆچەریی چوون، کاتی نانخواردن وەك و تەکبیریان کردبوو، سێدەر و دەروێش لە ژوورەوە دانیشتن، چەتەکان لە دەرەوە دانیشتن، نان دانراو نانیان خوارد.

گەورەی خێڵی کۆچەریی گوتی:

دوێنێ ڕۆحی کوڕی ئەمنت کڕیوەتەوە، لە پاداشتی ئەوەدا گوڵێك لەباخم دایە وێتدەدەم.

دەروێش لەبەر ئەوەی خۆشینەدەویست، گوتی:

قبوڵی ناکەم.

گەورەی خێڵ گوتی:

قسەی پێناوێ، ئەو ڕۆژە بە دەستووری خۆیان مارەیان کرد، حەوت ڕۆژ و حەوت شەو بوو بە شایی و هەڵپەڕکێ، ئەم ژنەی دەروێش برازای سەرۆکی خێڵی کۆچەریی بوو.

دەروێش حەوت ڕۆژان لەگەڵیدا بوو گوتی:

پێویستە بگەڕێمەوە بۆ شاری گەورە قەڵات، لەوێ پێویستیان پێمە، بازنگبەندێکی[84] زێڕی دابە ژنەکەی.

دەروێش گوتی:

گەر کچ مان بوو، بۆی بفرۆشە خەرجی شارێکە، گەرکوڕمان بوو، بیکە قۆڵی ڕاستی.

سەرۆکی خێڵی کۆچەریی گوتی:

لە کاتی تەنگانەدا نامەمان بۆ بنێرە وەفریات دێین، دەروێش خواحافیزی خواست و لەگەڵ سێدەردا بۆ شاخ گەڕایەوە، گرووپێك لە چەتەکان لە نزیك گەورە قەڵاتەوە بوون، هەواڵی تەواویان لەسەر شەڕ و

---

٨٤- بازنگبەند: ئەڵقەیەکی ئاڵتونە دەکرێتە قۆڵ.

پێکدادانەکان و تالانییەکانی ناو گەورە قەلات کۆکردەوە و گەڕانەوە بۆ چیا، ئەو هەواڵەیان بە سێدەر و دەروێش دا.

دەروێش دانەنیشت، خۆی پێچایەوە و ماڵئاوایی لە سێدەر و چەتەکان خواست و گوتی:

لە گەورە قەلات کارەسات ڕوویداوە، پێویستە بگەڕێمەوە بۆ لایان و بە هانایانەوە بچم.

سێدەر گوتی:

لە کاتی تەنگانەدا نامەمان بۆ بنێرە وەفریاتدێین[٨٥].

کاتێك دەروێش گەڕایەوە بۆ گەورە قەلات، شەڕکۆتایی هاتبوو، بینی دەروازەی شار شکاوە، هێشتا لاشەی هەندێك سەرباز لەوناوەدا کەوتووە، هاتە ناو شار، بینی چەندین خانوو سووتێنراون، هەندێ خانووی تر ڕووخێنراون، خەڵکی شار لە بارووداۆخێکی زۆر خراپدایە، ملك و ماڵی خەڵکی تالانکراوە، بارودۆخەکە زۆر سەخت بوو.

دەروێش چووە کۆشکی پاشا، لەوێ پاشا و وەزیرەکانی بینی، پاشای گەور قەلات گوتی:

سەدان کەسمان لێکوژراوە، ئابڕومان چووە، کچەکەمیان بەزۆر بە کەژاوەکەوە بردووە، سامانی ولات و ماڵی خەڵکیان تالانکردووە. سوپای ڕۆژهەلات دەستدرێژییەکی گەورەیان کردووەتە سەرمان، لە مێژوودا نموونەی نییە.

دەروێش بەو وێرانکارییە و بەتایبەت بە بردنی کچی پاشا بە کەژاوەکەیەوە زۆر تووڕەبوو، ئاور لە نێوچەوانی دەباریی، چونکە خۆشەویستی کچی پاشای گەورە قەلاتی لە دڵ چەقیبوو، گوتی:

---

٨٥– وەفریاتدێین: فریاتدەکەوین.

پاشا دەچمە سەر پاشای ڕۆژهەلات، ولاتەکەی تێکدەدەم، لەسەر کورسی پاشایەتی دەیهێنمەخوار، کچەکەتی لێدەستێنمەوە. لە کۆشك هاتەخوار و کەمێك بەناو شاردا گەڕا، دواتر بۆ لای کچی خەجوندی وەزیر چوو، گوتی:

دەچمە سەر پاشای ڕۆژهەلات، ولاتەکەی تێکدەدەم، ئینجا ئەم بازنگبەندە زێڕەت وێدەدەم، گەر کچ مان بوو، بۆی بفرۆشە خەرجی شارێکە، گەر کوڕمان بوو، بیکەرە قۆڵی ڕاستی، پێویستی گەشتەکەی سازکرد و ماڵئاوایی خواست، سواری ئەسپێك بوو، لە شار گەورە قەلات دوورکەوتەوە، بەرەو شاری پاشای ڕۆژهەلات ڕۆیشت، چەندین گرد و چەمی بڕی.

دەمەو ئێوارێ لە سەر چیایەك ڕووناکایی شارێکی بچووکی لێدەرکەوت، چیاکە زۆر سەخت بوو، بێشەو دارستانی زۆر بوو، شێرۆ گەیشتە شارەکە ناوی قەلای سەرچیا بوو.

شاری قەلای سەرچیا، شارێکی هەزار ماڵی بوو، تەواوی چیاکە داری بەریی بوو، ئەو شارە هەموو جۆرە میوەیەکیان هەبوو، کانی و ئاوی زۆری تێدابوو، جێگەیەکی زۆر دلڕفێن بوو.

شێرۆ زۆر ماندوو بوو، لە قەراغی شار، لە دەرگای ماڵێکی هەژاریدا، پیرەژنێك دەرگای کردەوە، ناوی پورە کەسکێ بوو، پیرێژنێکی وەجاخ کوێری بێوەژن بوو، خانوویەکی زۆر بچووکی هەبوو، خەڵکی هاوکاریان دەکرد و یارمەتیان دەدا. دەرویش گوتی:

میوان ڕادەگری؟

پیرێژن گوتی:

فەرموو وەرە ژوور، ئێرە ماڵی هەژارە، نەنانم هەیە نە پێخەف[٨٦]، دەروێش چووە ژوورەوە، بە دار و دیواری خانوەکەدا هەڵپەروانی بینی زۆر هەژارە، هەندێك زێڕی وێدا، پیرێژن چوو لە بازاڕ خواردن و پێخەفی پێکڕی، هاتەوە لە ماڵەوە نانیان خوارد، تا درەنگ دانیشتن و دوایی نووستن.

دەروێش بەیانی لە خەو هەستا، لە ماڵ هاتەدەر، کانی و ئاوێکی بینی، چووەسەر کانییەکە، دەست و دەمووچاوی شۆرد، لەو کاتەدا گوێی لە نەڕەی شێرێك بوو، هەستا پەلاماریدا و کوشتی، لەسەر کانیەکە پاڵکەوت، بەرامبەر کانییەکە ماڵی کچی پاشا بوو، پاشای سەرچیا کچێکی جوانی هەبوو، لە پەنجەرەکەوە سەیری (کانیجۆ)ی کرد، شێرەکە کوژراوە، پاڵەوانێك لەسەر کانییەکە پاڵکەوتووە، بە تیری ئەشقی گیرفتار بوو.

هەواڵیان بۆ پاشا برد، گوتیان:

حەوت ڕۆژە ئەو شێرەی (کانیجۆ)ی لێگرتووین، **(باڵدار لەوێوە فریبێ، باڵی وەراندووە، ناڵدار لەوێوە ڕۆشتبێ، ناڵی پەڕاندووە)** پاڵەوانێك کوشیویەتی.

پاشا گوتی:

ئەو پاڵەوانەم بۆ بێنن خەلاتی دەکەم، پاسەوانەکانی پاشا چوون هەواڵی پاڵەوانیان پرسی.

خەڵکی گوتیان:

لە ماڵی پوورە کەسکێ یە.

---

٨٦- پێخەف: نوێن.

پاسەوانەکان چوونە ماڵی پورەکەسکێ و لە دەرگایاندان پورە کەسکێ دەرگای کردەوە و گوتی:

فەرمانتان بە چییە؟

پاسەوانەکانی پاشا گوتیان:

پاڵەوانێك لێرە هەیە، پاشا خەلات کردووە! پورە کەسکێ شێرۆی لەو کارەساتە ئاگادار کردەوە، شێرۆش لەگەڵیان چوو بۆ لای پاشا.

پاشا کۆشك و تەلارێکی جوانی هەبوو، بەخێرهاتنی شێرۆی کرد، گوتی:

پاڵەوان ئەو شێرە حەوت ڕۆژە کانیجۆی لێگرتووین، (**باڵدار لەوێوە ڕۆشتبێ، باڵی وەران دووە، ناڵدار لەوێوە ڕۆشتبێ، ناڵی پەڕاندووە**)، تۆ کوشتووتە، لە پاداشتی ئەوەدا گوڵێك لە باخمدایە پێشکەشتی دەکەم، بە دەستوری خۆیان کچەکەیان لە دەروێش مارە کرد، حەوت ڕۆژ لەوێ هەڵپەڕین، دەروێش بوو بەزاوا.

دەروێش بازنگبەندێکی زێڕی دایە و گوتی:

گەر کوڕمان بوو لە قۆڵی ڕاستی بکە، گەر کچمان بوو، بۆی بفرۆشە، خەرجی شارێکە، ماڵئاوایی لێخواست.

پاشای سەرچیا گوتی:

لە کاتی لێقەوماندا نامەمان بۆ بنێرە وەفریاتدێین.

شێرۆ چەند ڕۆژێك بەرێگەوە بوو، گەیشتە نزیکی شاری پاشای ڕۆژهەلات، لە قەراغ شاردا، خێوەتێکی بچووکی هەڵدا، نەچووە ناو ماڵان بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێت.

پاشای ڕۆژهەلات دوای ئەوەی کچی پاشای گەورە قەلاتی بە کەژاوەکەیەوە برد، زانیاری لەسەر شێرۆ هەبوو، دەیزانی دێت و

پەلاماریان دەدات، هەوڵی گەڕانەوەی کچی پاشای گەورە قەڵات دەدا، بۆیە پاشای ڕۆژهەڵات وێنەی شێرۆی دا بە پاسەوانەکان، گوتی:
هەر کەسێك بتوانێ ئەم پاڵەوانە بگرێ، خەڵاتی دەکەم.
لەو لاوەش شێرۆ بەنهێنی تاقیبی شاری دەکرد، بە دوای کچی پاشای گەورە قەڵاتدا دەگەڕا، پارە و زێڕی بە نهێنی دەدا بە خەڵکی هەژار، بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر حەشارگەی ژنەکانی پاشا پێبڵێن، شێرۆ ئەوەی زانی کە وێنەکەی لای هەموو پاسەوانەکانی شار هەیە، بۆ ئەوەی بیگرن، بۆیە زۆر خۆی دەپاراست.
دوای گەڕانێکی زۆر بەنهێنی، شەوێك ئەو حەشارگە و باخچەیەی دۆزییەوە کە پاشای ڕۆژهەڵات پڕی کردبوو لە ژنە جوانە کانی دنیا، بەشی زۆری ژنەکانی پاشازادەبوون، هەندێکیانی بەزۆری شەڕ سەندبوو، هەندێکی تریانی بە ماڵ و سامانی دنیا، بەو جۆرە خاوەنی سەدان ژن بوو. کچی پاشای گەورە قەڵات لەو باخچەیەدا لە هەموو ژنەکان جوانتر بوو.
باخچەکە حەشارگەی ژنەکانی پاشای ڕۆژهەڵات بوو، لەتەنیشت کۆشکدا بوو، شورایەکی تایبەتی هەبوو، لە ناوەوە زۆر گەورە بوو، چەندین باخچەی گوڵ و گوڵزار و سەدان داری بەریی و فوارەی ئاو و چیمەنی هەبوو، بەدەوری ئەو باخ و باخاتەدا، خانووی ژنەکانی پاشا هەبوو، هەر ژنێکی خانوویەکی ڕازاوەی جوانی هەبوو، هی کەسیان لەوەی دی نەدەچوو.
شێرۆ بەهەزار فرووفێڵ توانی شەوی یەکەم بچێتە ناو ئەو حەشارگە تایبەتەوە، بەنهێنی خانووی کچی پاشای گەورە قەڵاتی بینییەوە و چووە لای، بۆ یەکەم جار دوای ئەو دابڕانە، کە کچی پاشای گەورە قەڵات شێرۆی بینی، باوەشیان لێکدا، ئەوین و خۆشەویستیان

گۆڕییەوە، تا بەیانی بەیەکەوبوون، بەیانی پێش تاوکەوتن[87]، شێرۆ گەڕایەوە خێوەتەکەی لە قەراغی شار.

چەند شەوێك ئەو یەکتر بینینانە بەردەوام بوو، هەندێك لە پاسەوانەکان چەند جارێك هەستیان کرد کەسێك دێتە ناو باخچەکە، هەواڵیان بۆ پاشا برد.

پاشا گوتی:

بەهەر نرخێك بووە، دەبێ بیگرن.

پاسەوانە تایبەتییەکانی پاشای ڕۆژهەڵات، بەنهێنی تاقیبی ئەو ڕووداوەیان کرد، زانیان کە ئەو کەسەی دێتە ناو باخچە تایبەتییەکەی پاشاوە، شێرۆیە و دێتە لای کچی پاشای گەورە قەڵات.

پاشا لە چوونی شێرۆ بۆ باخچە تایبەتەکەی زۆر تووڕە بوو، ئاوری دێنا، گوتی:

تا ئێستا بێجگە لەخۆم هیچ نێرینەیەك نەیتوانیوە بچێتە ناو باخچەکەمەوە، چۆن شێرۆ توانی بچێت، لەسەر ئەو ڕووداوە، هەندێك لە پاسەوانەکانی لە سێدارەدا و هەندێکی تریان سزای تونددا.

پاشا ڕاوێژکار و وەزیرەکانی کۆکردەوە و گوتی:

پێویستە بەزووترین کات، تەکبیرێك بۆ گرتنی شێرۆ بکەن. وەزیرەکان هەر یەکەیان کەوتنە تەکبیرکردن.

پاشای ڕۆژهەڵات گوتی:

شێرۆ دەگرم، بە جۆرێك سزای دەدەم، تا ئێستا کەسم وا سزا نەدابێت!

---

٨٧- تاوکەوتن: خۆرهەڵاتن.

## پاشای ڕۆژهەلاّت شێرۆ دەخاتە بیرەوە

دوا یەك ڕۆژ لە بیرکردنەوە، مام بارام ڕاوێژکاری پاشای ڕۆژهەلاّت، تەکبیری کرد، بۆ لای پاشا چوو، گوتی:
پاشا تەکبیرم بۆ کردی.
پاشا گوتی:
چۆن؟
ڕاوێژکار گوتی:
شێرۆ پیاوێکە زۆر ئازایە، گەر شەڕ بکات لایەکی سووپاکەت قڕدەکات، شەو دەچێتە لای کچی پاشای گەورە قەلاّت، دەمەو بەیانی بۆ خێوەتەکەی لە قەراغ شار دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوەی چەند شەوێکە نەخەوتووە، بەیانی کە هاتەوە زۆر ماندووە، بە سەدان پالّەوان دەدەین بەسەریدا و دەیگرین. با ئەمشەویش ڕێگە چۆلّکەین بچێتە باخچەکە، بۆ لای کچی پاشای گەورە قەلاّت، خەو لە چاویا ئەشکێتەوە، بەیانی بە ئاسانی دەتوانین بیگرین.
پاشا گوتی:
زۆر باشە، ئەم شەو با بەو شێوەیە بێت کە تۆ دەلّێیت.
دیسان پاشا گوتی:
دوای ئەوەی کە گرتمان، سزایەکی زۆر توندە دەدەم، لە دۆلێکی چۆلّ بیرێك هەلّدەقەنین[88]، چل گەز[89] قولّ بێت، شێرۆ دەخەینە ناوی، چل

---

٨٨– هەلّدەقەنین: هەلّدەکەنین.

٨٩– گەز: برێکی پێوانەییەبۆ پێوانەی درێژی بەکاردێت.

پاڵەوان دەکەین بە پاسەوانی، تا کۆتایی تەمەنی دەبێت لەو بیرەدا بێت.

ئەو شەو دوای ئەوەی شێرۆ خێوەتەکەی جێهێشت، بە فەرمانی پاشا، راوێژکاریان نارد چل پاڵەوانی لەگەڵ بوو، دەوروخولی خێوەتەکەی شێرۆیان گرت و خۆیان حەشاردا، بەجۆرێك هەر کەسێك بچووایەتە خێوەتەکە یان لەوێوە بڕۆشتایە، کەسی نەدەدی.

ئەو شەوە شێرۆ وەکو شەوەکانی دیکە، چوو بۆ باخچەکە، بۆ لای خۆشەویستەکەی، پاسەوانەکان بە فەرمانی پاشا، ئەو شەوە ڕێگەیان بۆ چۆڵکرد، تا بەرەبەیان لەوێ بوو، پێش تاوکەوتن، گەڕایەوە بۆ خێوەتەکەی، پاڵکەوت و کەوتە خەوێکی قوڵەوە، چونکە چەند شەوێك بوو، دەچووە لای خۆشەویستەکەی و نەدەنووست.

لە ناکاو پاڵەوانەکانی ڕاوێژکار لە هەموو لایەکەوە پەلاماری شێرۆیاندا، شێرۆ وەخەبەر هات، هەر چەندە پەلاماری دانەوە، چەند پاڵەوانێکی سەرەوبن کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی خەو زاڵبوو بەسەریا، لە کۆتایدا، پاسەوانەکانی ڕاوێژکار تووند گرتیان و بە گوریسێکی ئەستوور بەستیانەوە، پاشان بۆ پاشا یان برد.

پاشا بڕیاریدا و گوتی:

لە دۆڵێکی وشك، دوور لە شار و ئاوەدانی، بیرێك هەڵقەنن، چل گەز قوڵ بێت، شێرۆ بخەنە ناوی، پاشان بە گەڵیشك[٩٠] سەری بیرەکە بگرت، ئینجا چل پاڵەوان بکەنە پاسەوانی، تا کۆتایی تەمەنی دەبێت لەو بیرەدابێت.

ڕاوێژکار بڕیاری پاشای وەکو خۆی جێبەجێکرد، لەدەروەی شار بیرێکی قوڵی هەڵقەند، چل گەز قوڵ بوو، شێرۆیان خستە ناوی و بە

---

٩٠- گەڵیشك: گەڵای وشك.

گەڵێشك دەمی بیرەکەیان گرت، و چل پاڵەوانی کردە پاسەوانی بیرەکە، هەموو ڕۆژێك یەکجار خواردن و خواردنەوەیان بۆ شۆڕدەکردەوە، بیرەکە لەجێگەیەکدا بوو، بە ساڵی جارێکیش کەسێك لەوێوە نەدەڕۆی، ئەم ڕووداوە چەند ساڵێکی خایاند.

بابینەوە بۆ شاری گەورە قەڵات و بۆ لای کچەکەی خەجوندی وەزیر، کە ژنی شێرۆیە، بزانین چ دەگوزەرێت.

لە گەورە قەڵات دوای نۆ مانگ کچەکەی خەجوندی وەزیر ژانگرتی و کوڕی بوو، بازنگ بەندی زێڕیان کردە قۆڵی ڕاستی، لەلایەکی ترەوە کچی برازای خێڵی کۆچەران بەهەمان شێوی ژانگرتی و کوڕی بوو، بازنك بەندی زێڕی کردە قۆڵی ڕاستی، هەروەها کچەکەی پاشای سەرچیا کوڕی بوو، ئەویش بازنگبەندی زێڕی کردە قۆڵی ڕاستی.

لەو ماوەیەدا کە شێرۆ لە بیرەکەدا زیندانی بوو، کوڕەکانی گەورە بوون، هەریەکەیان پاڵەوانێکی بێڕەزابوون، شان و بازوویان لە باوکیان دەچوو، بەڵام یەکتریان نەدەناسی.

کوڕەکەی شێرۆ کە لای خێڵی کۆچەران بوو، ڕۆژێك بە ئەسپ پاڵەوانبازی کرد، سەیری لەش و لاری خۆی و خێڵەکەی کرد زۆر جیاوازییان هەبوو، ئەم پاڵەوان و ئەوان لەش و لاریان لاواز بوو، کەوتەگومانەوە و بیری کردەوە، گوتی:

لەوباوەڕەدام بابم لەم خێڵە نەبێ، لەگەڵ هەر کەسێکی خێڵەکەدا پاڵەوانبازی دەکرد، بە سەریا سەردەکەوت.

کوڕانی خێڵەکەی پێیان گوت:

ئەمماڵۆسە کەس نازانێ کوڕی کێیە؟

ڕۆژێك بە دایکی گوت:

دایە بابی ئەمن کێیە؟

هەرزەکارانی خێڵ پێمدەڵێن:

کەس نازانێ کوڕی کێی؟

دایکی گوتی:

ڕۆڵە باوکت پاڵەوانێکی گەورەیە و ناوی شێرۆ پاشایە، ئەو بازنگبەندەی قۆڵت هی ئەوە، پاشای ڕۆژهەلات کچی پاشای گەورە قەلاتی برد، باوکت بەدوویدا چوو بیهێنێتەوە، بەلام نەگەڕایەوە،

کوڕەکەی گوتی:

دایە ئەگەر ڕێگەم بدەیت، بە دوی بابی خۆمدا دەچم، دەگەڕێم تادەیدۆزمەوە.

دایکی گوتی:

ڕێگەت دەدەم، هەرۆ بۆ بابەت بگەڕێ، کوڕەکەی تفاقی پێویستی پێچایەوە و سواری ئەسپێك بوو ڕۆیشت.

لەلایەکی دیکەوە ئەو کوڕەی شێرۆ کە لە کچی خەجوندی وەزیر بوو، لە گەورە قەلات دەژیا، پاڵەوانێکی زۆر زەلام بوو، کەس نەیدەوێرا پاڵەوانبازی لەگەڵ بکات، ئەم کوڕەی هەر لە منداڵییەوە پێیان گوت بوو:

بابت بە دووی کچی پاشای گەورە قەلاتدا ڕۆیشتووە و نەگەڕاوەتەوە.

ڕۆژێك گوتی:

دایکە ئەمن لەوەتی لەدایکبووم، بابی خۆم نەدیوە، دەزانم بابم لە زینداندایە لای پاشای ڕۆژهەلات، ئەگەر ڕێگەم بدەی، دەچم ئازادی دەکەم.

دایکی گوتی:

ڕێگەت دەدەم، بچۆ بابت ئازاد بکە. ئەویش پێداویستی گەشتی پێچایەوە و سواری ئەسپ بوو ڕۆیشت.

ئەو کوڕەی شێرۆ کە لای پاشای سەرچیا بوو، بەهەمان شێوە بەدوی بابیدا گەڕاو ڕۆیشت، ئەو سێ برایە، نەئاگایان لەیەکتر بوو، نە یەکیشیان دەناسی.

ئەو کوڕەی شێرۆ کە لای خێڵی کۆچەری بوو، ڕۆیشت، شار بە شار و دێ بە دێ گەڕا، گەیشتە وڵاتی پاشای ڕۆژهەڵات، بۆ لای پاشا چوو و گوتی:

ئەمن کوڕی گەورەی خێڵی کۆچەریانم، بۆ سەیران و ڕاو هاتومەتە وڵاتی ئێوە.

پاشای ڕۆژهەڵات گوتی:

بابت دۆستی ئەمنە، بە ڕاوێژکاری گوت:

نامەیکی مۆرکراوی ئەمنی وێدە، کە هیچ کەسێك نەتوانێ ڕێی پێبگرێ. گوتی:

بە ڕاست و چەپی وڵاتدا بگەڕێ، کەس ناتوانێ بتگرێ، ئەم کوڕەی شێرۆ بە ئازادی بە شاردا دەگەڕا، بەنهێنی سۆراغی شێرۆیی دەکرد، گوتی:

لەوە ناچێت شێرۆیی لە ناو شاردا بێت، با بەناوی ڕاوەوە بچم گوند و شاخەکان بگەڕێم، گوند گوند دەگەڕا، ڕۆژێك ڕێگەی کەوتە شاخێك، لەوێ بزنێکی کێوی ڕاوکرد، خستییە سەر پشتی ئەسپەکەی، زۆری تینووبوو، لە دۆڵێکی چۆڵدا بیرێکی بینی، چل پاسەوانی لەسەرە، چوو بۆ لایان.

پاسەوانەکان گوتیان:

ئەو بزنەت بۆ ئێمە هێناوە؟

کوڕەکەی شێرۆ گوتی:

بەڵێ، ئاوریان کردەوە و نان و گۆشتێکی باشیان خوارد.

کوڕەکەی شێرۆ گوتی:

ئێوە چل پاڵەوانن، لەم دۆڵە چۆڵە لەسەر ئەو بیرە وشکە چ دەکەن؟

سەردەستەی پاڵەوانەکان گوتی:

خواغەزەبی لێگرتووین!

پاشا چەندین ساڵە پاڵەوانێکی خستۆتە ئەم بیرەوە، لەوکاتەوە ئێشکی لێدەگرین.

کوڕەکەی شێرۆ گوتی:

نێوی چییە؟

سەردەستەی پاڵەوانەکان گوتی:

نێوی شێرۆ پاشایە.

کوڕەکەی شێرۆ گوتی:

لە مێژە ئێوە لێرە ئێشکدەگرن، ئەم شەو هەمووتان بخەون، من ئێشك دەگرم، پاڵەوانەکان خەوتن، کوڕەکەی شێرۆ بەهێواشی دەستی بە لابردنی گەلیشکەکانی سەر دەمی بیرەکە کرد، لە خشەخشی گەڵێشکەکان، پاڵەوانەکان وەخەبەرهاتن، بوو بە پێکدادان، پەلاماری چل پاڵەوانەکەیدا و هەموویانی کوشت، لە خوارەوە شێرۆ گوێی لەو شەڕ و هەرایە بوو.

کوڕەکەی شێرۆ گوریسی شۆڕکردەوە و گوتی:

شێرۆ خۆت وەبەستە هەڵتدەکێشم.

شێرۆ گوتی:

ئەمن بە چل کەس لێرە هاوێژراوم، بە چل کەس نەبێ دەرنایەمەوە.

کوڕەکەی شێرۆ گوتی:

تۆ توونـد خـۆی ببەسـتەوە، مـن وردەوردە بـە گوریسـەکە لـە بیرەکـە دەردەدێنم، شێرۆ بە گوریسـەکە توند خـۆی بەسـت، ئەویش لـە بیرەکـە دەریهێنا.

شێرۆ بیست ساڵ بوو لەو بیرەدابوو، دنیای ڕووناکی نـەدیبوو، کـەمێك پەکی کەوتبوو پیر بووبوو.

شێرۆ گوتی:

پاڵەوان ئەتوو کێیت؟

قۆڵی ڕاستی هەڵکرد و بازنبەندەکەی پیشاندا.

کوڕەکەی شێرۆ گوتی:

ئەمن کوڕی ئەتۆم، توند باوەشیان بەیەکدا کرد و بەیەکتر شادبوونەوە، ئەسپ یان زینکرد و ڕۆیشتن.

ڕۆژی دوایی هەواڵیان بۆ پاشا برد، گوتیان:

چل پاڵەوانەکە کوژراون و شێرۆ هەڵهاتووە.

پاشای ڕۆژهەلات گوتی:

دەبێ بیگرن، لە بەردەم شاردا لە سێدارەی بدەن.

کوڕەکەی شێرۆ گوتی:

بابە ئێستا ئێمە ئازادین، بۆ وڵاتی خۆمان بگەڕێینەوە؟

شێرۆ گوتی:

لەسەر کچی پاشای گەورە قەلات وام لێهاتووە، تا نەیبەمەوە ناڕۆمەوە.

هەروەها شێرۆ گوتی:

ئەم شەو دەچمە لای خۆشەویستەکەم، زۆر لە مێژە نەمدیوە، شەو لە کوڕەکەی جوودابووەوە[91]، بۆ حەشارگە و باخچەی پاشا ڕۆیشت، گەیشتە لای کچی پاشای گەورە قەلات، سەیری یەکیان کرد، تێر باوەشیان بەیەکدا کرد، ئەوین و خۆشەویستی لە مێژەیان گەشایەوە، شێرۆ تێر بۆنی سەر و پرچی کرد، ئەو شەوە تا بەیانی لە ئامێزی یەکتردا نووستن.

لە بەرەبەیاندا پاسەوانەکان هەواڵیان بۆ پاشا برد، گوتیان:

پیاوێك لەگەڵ کچی پاشای گەورە قەلاتدا نووستووە.

پاشای ڕۆژهەلات گوتی:

بیگرن، پاسەوانەکان بەئاسانی شێرۆ یان گرت، چونکە پیر بووبوو، توانای بەرگری نەمابوو.

پاشای ڕۆژهەلات گوتی:

لە نێوقەدی شاردا بە دارێکەوە وەیبەستن، با سەد پاڵەوان پاسەوانی بکا، بۆ ئەوەی بەیانی لە بەرچاوی خەڵك لە سێدارەی بدەن.

ئەو بریارە، بڕیارێکی زۆر توندی پاشای ڕۆژهەلات بوو، زۆر بەخێرایی بە ولاتدا بلاوبووەوە، دۆست و دوژمنی ولات بەو بڕیارەی زانی، ئەوانەی دۆستی پاشا بوون، زۆر خۆشحاڵ بوون، بەلام ئەوانەی دوژمن و نەیاری پاشای ڕۆژهەلات بوون، دڵگران بوون، بۆیە هەر ئەو شەوە، نەیارانی پاشا لە هەموو لایەکەوە کەوتنە پلاندانان، بۆ ئەوەی شێرۆ پاشا ڕزگارکەن.

ئێستا ئێمە چاوەڕێی نەیارەکانی پاشای ڕۆژهەلات دەکەین، بزانین دەتوانن چی بکەن بۆ ڕزگارکردنی شێرۆ پاشا.

---

٩١– جوودابووەوە:جیابووەوە.

## شاور پاڵەوان شێرۆ بۆ بەرزە چیا دەفڕێنێ

نزیك لە وڵاتی پاشای ڕۆژهەڵات، چیایەکی بەرزی سەخت هەبوو، ناوی بەرزە چیا بوو، لوتکەی چیاکە هەمیشە سەربەتەم بوو، بەفری زۆر لێدەباریی و کوێستانی هەوارگەی خێڵانی کۆچەری بوو، کۆمەڵێك پاڵەوانی لێبوو، پاشای ڕۆژهەڵات بڕیاری کوشتنی دابوون، سەردەستەی پاڵەوانەکان ناوی شاور بوو، پاڵەوانێکی بێڕەزا بوو، لەگەڵ چەند پاڵەوانێکی دیکەدا چووبوونە بەرزە چیا، لە ترسی زوڵم و زۆری پاشا هەڵهاتبوون، ڕۆژانە لە ژێر دەستی پاشای ڕۆژهەڵاتدا، چەند پاڵەوان هەڵبهاتایە، بۆ لای ئەمان دەهات، چەند ساڵێك بوو هەڵهاتبوون، چاوەڕێی هەلێکیان دەکرد.

شاور هەواڵی لە سێدارە دانی شێرۆی پێگەشت، هەموو پاڵەوانەکانی کۆکردەوە، گوتی:

بەیانی پاڵەوانێك لە سێدارە دەدرێ، ناوی شێرۆیە و پاشازادەیە، ئەم شەو دەچین دەیفڕێنین، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە ڕزگارمان بێت، شیر و تیریان هەڵگرت و ئەسپیان زینکرد، بەرەو شاری پاشای ڕۆژهەڵات وەڕێکەوتن، ئەو شەوە لە شار پەلاماری پاسەوانەکاندا، هەموو پاسەوانەکانیان کوشت، شێرۆ یان بەرەو بەرزە چیا برد.

کوڕی یەکەمی شێرۆ کە کوڕی کچەکەی خەجوندی وەزیر بوو، لە گەورە قەڵات، گەیشتە شاری پاشای ڕۆژهەڵات، هەواڵی لە سێدارەدانی شێرۆ بیست، نامەی بۆ گەورە قەڵات نارد، گوتی:

دەسبەجێ سوپای گەورە بۆ سەر پاشای ڕۆژهەڵات بنێرن، هەروەها کوڕی دووەمی هەواڵی لە سێدارەدانی بابی بیست، نامەی بۆ خێڵی کۆچەران و سێدەر نارد، سوپا بۆ شەڕ بنێرن، کوڕی سێیەمی شێرۆش، ئەو هەواڵەی بیست، نامەی بۆ سەرچیا نارد کە سوپای بنێرن.

## شەڕی گەورە و ڕزگارکردنی کچی پاشای گەورە قەڵات

دەمەو بەیان هەواڵیان بۆ پاشای ڕۆژهەڵات برد، گوتیان:
شێرۆ هەڵهاتووە و پاسەوانەکانی کوژراون!
پاشای ڕۆژهەڵات جارێکی تر کۆبوونەوەی بە ڕاوێژکار و وەزیرەکان کرد و گوتی:
دەبێت بەخێرایی تەکبیربکەن و شێرۆ دەستگیر بکەنەوە.
بۆ ڕۆژی دوایی بەری بەیانی لە هەر چوار لای وڵاتی پاشای ڕۆژهەڵاتەوە، سووپا گەشت و خێوەتیان هەڵدا، لەلایەکەوە سووپای گەورە قەڵات و خێڵی کۆچەریان، لەلایەکی دیکەوە سووپای پاشای سەرچیا و سێدەر.
پاشای ڕۆژهەڵات ئەم بارودۆخەی بینی، گوتی:
ئێستا سووپای بێئەژمار ئامادەکەن، تەپڵی شەڕی گەورە لێدرا، بە هەزاران سەرباز چەکیان هەڵگرت و ئامادەی جەنگ بوون، ئەوە یەکەم جار بوو، لەشکر هێرش بهێنێتە سەر شاری پاشای ڕۆژهەڵات.
لە بەرەبەیاندا تازە تاو کەوتبوو، شەڕ دەستی پێکرد، دۆست و دوژمن بەیەکیدا دەدا، هێند کاریگەر بوو، خوێن سەر دەبرد، ئەو هەموو سووپایە، پەلاماری پاشای ڕۆژهەڵاتیاندا.
لەملاوە لە بەرزە چیاوە ڕێزی زۆریان لە شێرۆ گرت، هەواڵی شەڕی گەورەیان پێگەشت.
شێرۆ گوتی:
خۆتان سازکەن بۆ شەڕ دەچین، پاڵەوانەکان ئەسپەکانیان زینکرد، شیر و تیریان هەڵگرت، بەرەو شاری پاشای ڕۆژهەڵات ڕۆیشتن، لە مەیدانی شەڕەکە خێوەتیان هەڵدا، شێرۆ لە خێوەتەکەوە سەیری شەڕەکەی دەکرد، پاڵەوانەکان بە ئەسپەکانیانەوە بۆ ناوەندی شەڕەکە دەچوون،

دەجەنگین تاماندوو دەبوون، لە پاشدا بۆ خێوەتەکانیان دەگەڕانەوە، دادەنیشتن تا ماندوێتیان دەردەچوو، دیسان بۆ مەیدانی شەڕ دەچوونەوە و دەجەنگین، ئەوە بەردەوام بوو.

شێرۆ پاڵەوانێکی بێڕەزای بینی، دووژمن بەهیچ جۆرێك خۆی بۆ نەدەگرت، چووە خێوەتی پاڵەوانەکەوە دانیشت، پاڵەوانەکە ماندوو بوو، بۆ خێوەتەکەی گەڕایەوە.

شێرۆ گوتی:

پاڵەوان ئەسپەکەتم وێدە، با پاڵەوان بازییەکی پیبکەم.

پاڵەوانکە گوتی:

ئەتو کێیت؟

گوتی:

ئەمن شێرۆ پاشام.

پاڵەوانەکە قۆڵی ڕاستی بۆ هەڵکرد و بازنگبەندەکەی پیشاندا.

شێرۆ گوتی:

تۆ کوڕی ئەمنی، باوەشیان کرد بەیەکدا و بەیەکتر شاد بوونەوە، لەوکاتەدا دوو کوڕەکەی دیکەی شێرۆ چاویان لێبوو بەغار بۆ لایان هاتن، هەموویان بەیەك شاد بوونەوە.

شێرۆ و کوڕەکانی بەیەکەوە هێرشێکی فراوانیان کردە سەر سووپای پاشای ڕۆژهەڵات، بەرگەی ئەو هێرشەی نەگرت، سووپاکەی لێك ترازاو بڵاوبوو، سەدان کەس لە سووپاکەی کوژرا.

پاشان زارکی گەورەی شاریان کردەوە و چوونە ناو قەڵاتی پاشای ڕۆژهەڵاتەوە، قەڵاتەکەیان گرت، پاشایان لە قەڵات هێنایەخوار، لە بۆ هەتاهەتایە زیندانیان کرد، کوڕەکانی شێرۆ چوونە ژوورەوە، دەرگای ئەو باخچەیەیان کردەوە، کە پڕ بوو لە ژنە جوانەکانی دنیا، کچی پاشای گەورە قەڵات یان بۆ باب یان هێنایەدەر و هەموو ژنەکانی تریان ئازادکرد.

دوای ئەوەی کە جەنگ کۆتایی هات، شێرۆ پاشا لەگەڵ سەرلەشکری هەموو سووپاکاندا کۆبووەوە، سەردەستەی پاڵەوانە یاخییەکانی بەرزە چیای کرد بە پاشای ڕۆژهەڵات و وڵاتی دایەدەست.
شێرۆ پاشا بە سووپای گەورەوە بۆ گەورە قەڵات گەڕایەوە، پاشای گەورە قەڵات کۆچی دوایی کردبوو، بۆیە سێدەری کردە پاشای گەورە قەڵات و وڵاتی دایە دەست.
لە کۆتایدا بەو سوپا گەورەیەوە بەرەو وڵاتی شاروخ پاشا گەڕایەوە. ئارچە هەواڵی ئەو هێرشە گەورەیەی پێگەشت، چەتەکانی کۆکردەوە، گوتی:
هێرشێکی گەورەمان لەلایەن شێرۆوە دەکرێتە سەر، سوپای گەورەی لەگەڵە، چی بکەین؟

چەتەکان وتیان:
خۆمان دەدەین بەدەستەوە، شەڕی ئەو سوپایەمان پێناکرێ، شێرۆ پیاوێکی دڵ پاکە، هەمووومان دەبەخشێ! سووپای گەورە هاتە دەروازەی شار، ئارچە و چەتەکان خۆیان دابەدەستەوە.
شیرۆ گوتی:
ئارچە و چەتەکان دەبەخشم بەمەرجێ واز لە کاری خراپ بهێنن، شێرۆ دەرگای خەزێنەی کردەوە، زێڕێکی زۆری دا بە هەژاران، پاشان خەڵکی شار جارێکی تر، شێرۆ پاشایان خستەوە سەر تەختی پاشایی، کچی پاشای گەورە قەڵات شاژنی گەورە بوو، ژنەکانی دیکەش گەڕانەوە بۆ لای شێرۆ، بە ئاسوودەیی ژیانیان دەستی پێکردەوە، لەو ڕۆژەوە خێر و خۆشی و ئاوەدانی ڕوویکردەوە تەواوی ناوچەکە و وڵاتی شاروخ پاشا.

# وتەیەک لەسەر چیرۆکخوان

ئەم دوو بەرهەمە ئەفسانەییەم لە چیرۆکخوانی بەڕێز (حاجی ڕەسول حاجی عەلی کاڕەسو) وەرگرت، نەوەی (مام برایم)ی ماقوڵی نورەدینیە، لە گوندی ئیسیوە، ناوبراو ڕێشسپی گوندەی ئیسیوەیە، ئێستا لە ژیاندا ماوە، تەمەنی زیاتر لە هەشتا ساڵی تێپەڕاندووە.

حاجی ڕەسوڵ پیاوێکی قسەخۆشە، هەمیشە پێکەنین لەسەر زاریەتی، داستان و ئەفسانەی کوردی دەگێڕێتەوە، بەشەوان کۆڕ و کۆبوونەوەی بۆ سازدەکرێت و کوڕ و کچ، لاو و پیری گوند، بەدەوریا دادەنیشن و شەوی گوێ ئاگردانی کوردی گەرم دەکا، بەتام و لەزەتێکی زۆرەوە ئەفسانەکان دەگێڕێتەوە، گوێگران کێشدەکا بۆ ناو خەیاڵاتی ئەفسانە، جارجار لە ناو ئەفسانەکەدا دەوەستا و بابەتی کۆمیدی دەگێڕایەوە، دەور و بەری دەیاندایە قاقای پێکەنین، هەندێ جاریش بەسەرهاتی کارەساتباری دەگێڕایەوە، هەموو غەمبار دەبوون، لەناکاو چا و شەوچەرە دەهات، دوای کەمێك پشوو، جارێکی دی دەستی بە گێڕانەوە دەکردەوە.

ئەو ئەفسانەیەی کورت بووایە، بەیەك شەو و ئەو ئەفسانەیەی درێژ بووایە، بە زیاتر لە شەوێك دەیگێڕایەوە، بەپێویستم زانی کە ئاماژە بەوە بدەم کە ئەفسانەی (سەلیمی جەوهەری)، بە دوو شەو گێڕایەوە، کە بەرواری شەوی (٧ و ٢٠٠٩/١/٨) بوو، هەروەها ئەفسانەی (شێرۆ)ی بە چوار شەو گێڕایەوە، کە بەرواری شەوی (١١ تا ٢/١٤/ ٢٠٠٩) بوو.

وەکو خەڵکی ناوچەکە منیش لەو کۆڕ و کۆبوونەوانەدا دادەنیشتم، زۆر چێژبەخشبوو، هەروەها گوێبیستی کۆمەڵێك بەسەرهات و ڕووداوی

سەیر و سەمەرە دەبووم، کە پێشتر گوێبیستی نەبووم، بەڕێز حاجی ڕەسوڵ کە ئەفسانەکەی دەگێڕایەوە، لە شوێنی زۆر کاریگەر و پێکەنین ئامێزدا، دەیبڕ و دەیگوت: ئەوەی دی بۆ شەوی داهاتوو، هەموومان زۆر تامەزرۆ بووین، تا شەوی ئایندە لەبیری ڕووداوەکاندا بووین، بۆیە بەپێویستم زانی کە لە دووتوێی ئەم بەرهەمەدا تۆماری بکەم، بۆ ئەوەی ئەم داستانانە لە فەوتان بپارێزم، خوێنەری کوردیش پێی ئاشنابێت.

# فەرهەنگۆک

بەپێویستم زانی لە کۆتایی ئەم بەرهەمەدا، فەرهەنگۆکێی بچووك ئامادەبکەم، لە نێوان وشەکانی هەردوو بەشە شێوەزاری موکریان و سلێمانیدا، بۆ ئەوەی واتای وشەکان ڕوونتر بێتەوە، خوێنەر بەئاسانی تێیان بگات، هەروەها وشەی ئەم فەرهەنگۆکەم بەپێی ڕیزبەندی پیتەکانی زمانی کوردی ڕیزکردووە، ڕاستەوخۆ وشەکانم وەرگرتووە و واتای بەرامبەرم بۆ داناون یان واتای نزیکی خۆیانم بۆ دیاری کردووە، ئەمە گرنگی زۆری هەیە لە ڕووی واتاییەوە، بۆ زمانی کوردیی.

## پیتی (ئ)

| | |
|---|---|
| ئەوك | قورگ |
| ئاونگ | شەونم |
| ئارۆێ | خەیار |
| ئەستێرك | ئەستێڵك |
| ئەوەندووکە | یەك تۆز |
| ئیستیکان – ئیسکان | پیاڵە |
| ئاور | ئاگر |
| ئیشك | وشك |
| ئەسان | هەسان |
| ئەوجا | ئینجا |
| ئەدێ | ئەرێ |
| ئەستوور بوو | ئاوسابوو |
| ئەسپە شێ | ناوی جۆرێکە لە ئەسپ |

## پیتی (ب)

| | |
|---|---|
| بەقەو | بەقایمی |
| بەرهەڵدان | بەردان |
| بەرەشێو | خـواردنی هـەڵگیراوی لێنـەنراو وەك ماش، نیسك...هتد |
| باولی | باوەڵ |
| بژوێڵك | برژانگك |
| بەتەویاخوا | بەتەمای خوا |

| | |
|---|---|
| بانکهێشتن | بانگکردن |
| بەری بواردووە | بەو ماڵاتە دەوترێ کە وەختی بەریەتی، بەڵام بەری نەگرتووە و تەمەنی ساڵێك زیاترە، نێری نەگرتووە بزێ. |
| بەدەوڵەت بن | سڵاوێکی تایبەتییە، لە شوان دەکرێ. |
| بەندی هەڵاوێشتووە | شیبوونەوەی زەوی بە سەوەڵ بەندان. |
| بانگکهێڵان | بانگکردن |
| بەدووداچوون | بەدوواداچوون |
| بێزلێهەستان | بیزلێهاتنەوە |
| بێرکردن | دۆشینی مەڕ یان بزن بەسەرە |
| برێم | بەو داربەڕووە دەوترێ کە گەڵاکانی بۆ ماڵات لێکرابێتەوە، تازە گەڵای وردی دەرکردبێ. |
| بیژۆك | ماڵاتی زاو کە تەمەنی ساڵێك کەمتربێت. |
| بێنوو | بیانوو |
| بوورزوو | شاڵ |
| بن هەنگڵ | بنباڵ |
| بۆقژە | جۆرە نەخۆشییەکی منداڵانە |
| بۆڕ | جۆرە گیایەکی کوێستانییە و ئالیکێکی گرنگە بۆ ماڵات |

| | |
|---|---|
| بیراستن | بەو جۆگەلە ئاوانە دەوترێ، کە دیواری ژێر و ئەم لاو ئەو لای بە بەرد بۆ دروستدەکرێ، بۆ ئەوەی ئاوی پیابڕوا و سەرەکەی بە بەرد دەگیرێ. |
| بێلاّ | هەیوان |
| باباوا | باوکە ئادەم |
| بەچنە | بەرچنە |
| بەردووچکە | بەردی پچووك |
| بەردەباز | بەو سەری بەردانە دەوترێ کە لە ناو ئاودا دیارن، خەڵکی بەسەریاندادەپەڕێتەوە . |
| بەرگن | بەو خورییە دەوترێ کە بە پشتی کاوڕ واتە بەچکەی مەڕەوەیە. |
| بە پووکان دەخورێ | بە لێو دەخورێ مەبەست لە شتی ئاسانە. |
| بەتەنێ | بەتەنیا |
| بەتەنی تاقێ | بەتاقیتەنیا |
| بەخێرچی | خوات لەگەڵ |
| بەرمێشە – بنەوشە | بەری دارێکی خۆرسکی کوێستانییە، وەك قەزوانی سەوز وایە بەلاّم ناسکترە. |
| بالیف | سەرین |
| بێوڵە | بەچکەی ورچ |

| | |
|---|---|
| بازنگك بەند | مەبەست لەو بازنگەیە کە دەکرێتە قۆڵ |
| باژەڵە | جۆرە نەخۆشییەکی منداڵانە |
| باری ژووروو | ڕەشەبا – بای تووند |
| باوەشك | باوێشك |
| بزنەڕێ | کوێرە ڕێ – باریکە ڕێ |
| بێعار | هار |
| بن | ژێر |
| باب | باوك |
| بەرێیکە | بینێرە |
| بیجاو | بیجوو |
| بەتەنێ | بەتەنیا |
| بیور | تەور |
| بەبەڵم | ئەو توێکڵە تەنکەیە کە بەدەوری برنجەوەیە. |
| بێڕەزا | بەهێز و دەسەڵات |
| بیور | تەور |
| بەدوتدا | بەدواتدا |
| بەیەکدادا | بەیەکدا کێشا |
| بەسەر خۆی نەهێنا | گوێی نەدایە |
| بەتۆپزی | بەزۆر |
| بازنگبەند | ئەڵقەیەکی ئاڵتونە دەکرێتە قۆڵ |

## پیتی (پ)

| | |
|---|---|
| پۆل – پۆلوو | پشکۆ |
| پێدانووسان | دەم پێوەنان |
| پسا | پچڕان |
| تەماشاکردن – لێڕوانین | سەیرکردن |
| پوورەی داوە | بەو هەنگانە دەوترێ کەلە باوان جیابوونەتەوە. |
| پەل | لق |
| پەلك | گەڵا |
| پەسەپسۆکە | هۆرەپەزە – هەڵەپەزە |
| پێش نوێژ | پێش نیوەڕۆ |
| پاش نوێژ | پاش نیوەڕۆ |
| پێکدادان | بەیەکدادان |
| پرێسکە | بوخچە |
| پێ بەند | ئەو پەتەی مانگای پێ دەبەسترێتەوە |
| پێ خواس | پێ پەتی |
| پرچ | قژ |
| پێلاقە | پێلەقە |
| پرینچك | پریشك |
| پێداکردن | پیاکردن |
| پاردە | بە شوێنی ناو کەڵەکی پیاوچاك دەوترێ. |
| پێرکی نوێن | ژێرنوێن |

| | |
|---|---|
| پەتك | پەت |
| پێخەف | نوێن |

## پیتی (ت)

| | |
|---|---|
| تاوڵ | ڕەشماڵ –دەوار |
| توێڵك | توێكڵ |
| تێكنەگەیشتن | لەیەك نەگەشتن |
| تورهەڵدان | فرێدان |
| تێهاویشتن | تێفرێدان |
| تاتی نوێژ | بەردە نوێژ |
| تیغ | بە هەرشتێ دەوترێ كە دەمی تێژی هەبێ وەك چەقۆ. |
| تەڕاو | سواغدانی دیوار بە قوڕی خەست، بەمەستی لووس بوون. |
| تێوەردان | تێهەڵسوون |
| تۆپی بەجوغزێ | یارییەكی كوردەوارییە |
| تاقە | تاق مەبەست لە تاقی دیوارە |
| تەمبەڵ | تەممەڵ |
| تەندوور | تەنوور |
| تەلدڕوو | تەلی دڕكاوی |
| تەمبێكردن | تەمیەكردن |
| تاژی | تانجی |
| تیك | درز و كەلێن |

| | |
|---|---|
| توربین، توربینە، توربێنە | جۆرە تورەکەیەکە لە مووی بزن دروستدەکرێ و شتی تێدەکرێ و بۆ دەرەوەی ماڵ دەبرێ. |
| تۆپزی | بەزۆر |
| تێوڵە | تێگوشیو |
| تات | بەردی نوێژ |
| تیك | درز |
| تێینابێ | تیایینابێ |
| تاودایە | هەڵگرت |
| تێلیس | گوێنی |
| تاوکەوتن | خۆرهەڵاتن |

**پیتی (د)**

| | |
|---|---|
| دەستاونگ | دەسکەوان |
| دەندووك | دەنووك |
| داهاتن | چەمانەوە |
| داسە | داس |
| دینکە | نـاوی قەڵایـەکی مێژوویيـە، لـە گەندی نورەدین لە پشدەر. |
| داکردن | گلدانەوە |
| داقەڵاشتن | داقڵیشان |
| دایسان | داگیرسان |
| داهێلان | شۆڕکردنەوە |
| دەڵێم | ئەڵێم |
| دەڵێی سەرکلکی مارییە | مەبەست لە شتی تاڵە |

| | |
|---|---|
| دەسڕۆکە | دەسڕی سەرچۆپی |
| دەرپێ قووڵە | دەرپێکورت |
| دەستەوانە | دەسکێش |
| دەنا | ئەگینا |
| دەیهەوێ | دەیەوێ |
| دەدڕێ بە پێکەنین | زۆر پێدەکەنێ |
| دەستاو | - بەو ئاوە دەوترێ کە ژن لەکاتی هەویر شێلاندا دەستی پێتەڕدەکات.<br>- بەکانییەك دەوترێ کەدەستاوێك ئاوی پیابێ.<br>- بەو ئاوەدەوترێ کە وەستای بنێشتکەر لەکاتی بنێشتکردندا دەستی پێتەڕدەکات. |
| دوێراو | دێراو |
| دووڕە | دووڕەگ |
| دم چۆم | کەناری چەم |
| دیتن | بینین |
| دڕوو | تووتڕك، تووەکێویلکە |
| دۆدانە | لە پێستی ماڵات دروستدەکرێ و دۆی تیا هەڵدەگیرێ. |
| دم ڕووت | کەسی تازە پێگەشتوو |
| بەئاودا هێلان | بەدەم ئاوەوەدان |
| دەرگاکوتان | لەدەرگادان بە تووندی |

| | |
|---|---|
| دەبەبوون | قۆڕبوون |
| داشقەوبارگین | ئەسپ و عەرەبانەی تریشقە |
| داکاوا | دایە حەوا |
| دێخون | بەنەخوێن، دووخوێن، دۆخین |
| دەقڵشێ | دەقڵیشێنێ |
| دەبەروان | لەبەرئەوان |
| دادەگێڕێ | دەهێنێتەخوار |
| دەچتە | دەچێتە |

## پیتی (ڕ)

| | |
|---|---|
| ڕەژوو – ڕەژی | خەڵوز |
| ڕەمەند | نێوانی دوو مڵکی کشتوکاڵی |
| ڕژد | پیسکە و ڕەزیل |
| ڕاو | ماڵە |
| ڕاکشاو | پاڵکەوتن |
| ڕمب | ڕم |
| ڕنووە بەفر | بە لاپاڵێك دەوترێ کە با بەفری تیاکۆکردبێتەوە. |
| ڕۆهێلان | شۆڕکردنەوە |
| ڕێخستن | لێخشان |
| ڕۆنراو | بەقیتەوە دانراو |
| ڕاخزی | ڕۆشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك دی |
| ڕەدووکەوتن | هەڵگرتن |

| | |
|---|---|
| ڕایگڕوو | ڕاکێشانی خەڵووزی ناو ئاگردان بۆ دەرەوە. |
| ڕمبی لێهات | دەنگی لێهات |
| ڕێیدێرە | لایبەرە |
| ڕایماشت | پاکی کردەوە |
| ڕوانگە | ئـەو شـوێنەی ڕاوچـی تێیـدا دادەنیشن بۆ ڕاو. |
| ڕۆکرد | پێداچەقاند |

## پیتی (ز)

| | |
|---|---|
| زەڕ | زێڕ |
| زەنگاڵ | پوزەوانە |
| زاویتە | جۆرەبایەکی سارد و شێدارە |
| زاوییە | ژێر نووێن |
| زبڵ | مەبەست لە پەینی ماڵات |
| زبان | زمان |
| بەدەمار | بـە کەسـێکی ئـازاو قارەمـان دەوترێ |
| زینوو | گرد |
| زریقەزریق | زریکەزریك |
| زڵق | بلّق |
| زار | دەم |
| زك | سك |
| زەردەیدا | مەبەست لە خۆرهەلاتنە |

| | |
|---|---|
| زامداریکرد | برینداریکرد |

## پیتی (ژ)

| | |
|---|---|
| ژیکەڵ | وتووریا |
| ژاوەژاو | دەنگەدەنگ |
| ژینەوە | ژیانەوە |
| ژووشك | ژیشك |

## پیتی (س)

| | |
|---|---|
| سەردەبەرخۆنان | سەرداخستن |
| سوول | تاقگە |
| سورمەساقە | زەرنەقوتە – قۆزمەسوورە |
| سەر بەکڵۆکە | خەیاری ناسك و تازەپێگەشتوو |
| سازۆك | تەڕەساز |
| سینگ | سنگ |
| سنگەسە | شوێنی بەستنەوەی سەگ |
| سواڵك | پارچەگۆزەی شکاو |
| سیخەسۆڵە | چلورەی بەفر |
| سوراو | – بەئیشێك دەوترێ کەپارەی زۆر لێدەس کەوێ.<br>– بەو گڵەسوورە دەوترێ کە بارانـاو تێکـەڵی ئـاوی ڕووبارەکـانی دەکـات و ڕەنگگەکەی سوور دەکات.<br>– بەواتای میکیاج بەکاردێ. |

| | |
|---|---|
| سێڵە | – ساجی نانکردن<br>– جۆرەگیانلەبەرێکی ئاوییە. |
| سەرچنگ کەوتن | کـــەوتن بەســـەر دەســـت و ڕوومەتدا |
| سەرکۆنە | سەرزەنشت |
| سەرانگوێلك | شوێنی خۆڵ ڕشتن |
| سەوە | وەك بەرچنەوایە |
| سەرەمرە | بـە مـریش یـان قـەل و قـازێگ دەوتـرێ کـە تەمـەنی لـە پێـنج ساڵ زیاتر بێ. |
| سەد لەسەد | لە سەداسەد |
| سەردۆز | وەك جنێو بەکاردێ |
| سەنگ | –کێش<br>– بەرد |
| سیپەلاك | سی |
| سۆزانە | مەکراوی |
| سیوڕك | بـە بـەردێك دەوتـرێ کـە پـڕ بەمشتبێ. |
| سارداو | بـە ژوورێـك دەوتـرێ کەلەسـەر کـانی دروسـتبکرێ، ئـاوی کانییەکـەی تیـا کۆدەکرێتـەوە، ساردەبێ، بەڕۆژ دەخورێتەوە. |
| سەبەکی مەشکێ | سێپای مەشکە |
| سە | سەگ |

| | |
|---|---|
| سەرکۆنە | سەرزەنشت |
| سەرجۆخین | شوێنی گەنم پێوان |
| سیمرخ | باڵدارێکی ئەفسانەییە |
| قەتارچی | بازرگان |

## پیتی (ش)

| | |
|---|---|
| شەپیلك | دەفەی شان |
| شەپکە | بەو پارچەدارە تەختە دەوترێ، کە دوو داری دارەڕای سەقفی پێ قایم دەکرێ. |
| شەکر شەکرۆکە | مادەیەکە شیرینە و دەخورێ، درکی کەرتەشی دەریدەکات. |
| شەڵتە | لە گوێنی گەورەترە و کای تێدەکرێ. |
| شەوی | بەو ئاوە دەوترێ کە شەو دەخرێتە بەر هەوا بۆئەوەی ساردبێت بۆ خواردنەوە. |
| شەکیلە | قوڕی زۆر شل |
| شەوتێ | نەخۆشی تا |
| شوژن | سوژن |
| شێرە | ئەو دارە ئەستورانە دەوترێ کە لە گوێسوانەوە هاتونەتەدەر. |
| شاقەل | داوێن |
| شرە و برە | پەڕۆوپاتاڵ |

| | |
|---|---|
| شریت | پەت |
| شو | شوڵی دار |
| شیپانە | چوارچیوەی دەرگای دار |
| شوشتن | شتن |
| شیشوق | وردە شوشە |
| شەپڵە | نەخۆشییەکی کوشیندەیە تووشی مرۆڤدەبێ. |
| شیو | خواردن |

## پیتی (ج)

| | |
|---|---|
| جەهوو | مادەیەکی زەردی لینجەداری چەقالە دەریدەدات لە وەرزی پایزدا. |
| جلك | جلوبەرگ |
| جوودا | جیاواز – جیا |
| جیقم کرد | دیقم کرد |
| جەمەدانە | جامانە |
| جەرگ | جگەر |
| جەڵەب | مەبەست لە کۆمەڵێك مەڕوماڵاتە بۆ فرۆشتن. |
| جۆماڵ | کاری پاك کردنەوەی جۆگەی ئاو |
| جیقنە | ریقنە |
| جندۆکە | جنۆکە |

| | |
|---|---|
| جمین | تەپین |
| جورج | جرج |
| جستان | زستان |
| جەحێڵ | گەنج |
| جیران | دراوسێ |

## پیتی (چ)

| | |
|---|---|
| چۆك | ئەژنۆ |
| چاك | مەبەست لە پیاوچاكە |
| چ نییە | هیچ نییە |
| چووك | بچووك |
| چقڵ – چەقڵ | درك |
| چادان | شوێنی هەڵگرتنی چا |
| چەلاو | گۆشتاو |
| چەنگ | چنگ |
| چەپەر | جورێك دەرگایە لە شووڵ دروستدەكرێ. |
| چەقوو | چەقۆ |
| چۆم | چەم |
| چوێلەكە | چۆلەكە |
| چەتە | پیاوخراپ |
| خەرا | خراپ |

## پیتی (ح)

| | |
|---|---|
| حەیاتی ڕەشی داوە | مردووە |
| حەوتەلۆ | جــۆرە نەخۆشــییەکە تووشــی منداڵ دەبێ. |

## پیتی (خ)

| | |
|---|---|
| خەشیوە | شوێنی هەڵگرتنی زەخیرە. |
| خۆڵەبان | گڵە بان |
| خڕیلکە | مارمارەی قوڕ |
| خاکییە | کەسی سادەو ساکار |
| خیز | زیخ |
| ختك | پشیلە |
| خۆشارکێن | چاوشارکێ |
| خرپە | خورپە |
| خێزەرە | مەبەســتــ لــە کۆمــەڵێك کەســە بــەخێرایی خۆیــان بــە ماڵێکــدا بکەن. |
| خرویلکە – خرویتکە | ئاوڵە |
| خەڕەك | چەرخ |
| خەندان | خانەدان |
| خەزەڵ | گەڵای وەریوی دار |
| خەرتەل | سیسارکەکەچەڵە، باڵندەیە |
| خەون | خەو |
| خەپەتۆڵەکە | مرۆڤی قەڵەو |

| | |
|---|---|
| خڕکی وێڵ | بەردی وێڵ، بە بەردێ دەوترێ کە هەڵدرێ و کەس نەزانێ کێیە. |
| خڕ | شیوو یان دۆڵ |
| خونکردن | سەرەوخوارکردن – دەمەونخونکردن |
| خوانە | پنە |
| خوازا | خوشکەزا |
| خەرا | خراپ |

## پیتی (ف)

| | |
|---|---|
| فریزوو | چیمەن |
| فاقە | جلگر |

## پیتی (ق)

| | |
|---|---|
| قشکردن | کردنەوە |
| قەرخ | – چاڵی بناغەی خانوو |
| قەیاغ | ئەو ئامێرەیە کە بۆ پەڕینەوەی مرۆڤ لە ئاو بەکاردێ. |
| قەیدی چییە | قەیچێکە |
| قەیدێناکە | قەیناکە |
| قەپیو | قوپاو |
| قەننە | سەبیل |
| قەراغ و بیجاخ | کەنار و دەوروبەر |

| | |
|---|---|
| قەلان دۆش | قەڵان دۆشكان |
| قەڵە قەڵ | قاڵە قاڵ |
| قایل بوون | ڕازیبوون |
| قامكە قلیچە | پەنجە تووتە |
| قەنیلە | ختووكە |
| قوڕقوڕۆكە | قوڕقوڕاغە |
| قوڵ | چاڵ |
| قرژكردن | بڵاوكردن |
| قوتڕ | بـــەوڵاخی پـــیرو پەككەوتـــە دەوترێ. |
| قوڵكاورە | شوێنی ئاگركردنەوە |
| قم بوون | نوقمبوون |
| قمقمە | مەتارەی ئاو |
| قەتار | ڕیزبەستنی بازرگانی |
| قج | چـق ئـەو بەشـەزیادەیە کـە لـە قاچی پەلەوەر دێ. |
| قوڕنە | قوژبن |
| قیسپ | داری ڕێك |
| قامك | پەنجە |
| قیل | قیر |
| قاوت | توی وشككراوی كوتراو |
| قۆڵت | چاڵ |
| قەڵات | قەڵا |

## پیتی (ك)

| | |
|---|---|
| کەواندن | خستن |
| کەڵب | کەڵبەی دان |
| کەند | گرد |
| کەرتەشی | جۆرە دڕکێکی کێوییە |
| کەو | وەك بێژنگ وایە بۆ نۆك بێژانەوە بەکاردێ. |
| کەنوو | زەردەخەنە |
| کەپەنگك | جۆرە پاڵتۆیەکە شوانەکان بۆ بەفر و سەرما لەبەریدەکەن لە بەرگن دروستدەکرێ. |
| کەماو | گۆشتاو |
| کەلاێن | هەڵماتێن |
| کەلا بەرد | گولۆر – گولێر |
| کسۆك | سەگ |
| کوڵکن | توکن |
| کۆختە | خاوەن باخی هەنارەکان، لە وەرزی پایزدا لە ناو باخەکانیاندا لە شوێنی تایبەتیدا هەنار دەشارنەوە پێی دەوترۆێ کۆختە. |
| کیفی مار | کاژی مار |
| کوتکی بن بەڕێ | یارییەکی کوردەوارییە. |
| کۆلکە شۆك | ئامێرێکی دارە ترێی تیا |

| | |
|---|---|
| | دەگوشرێ، بۆ دۆشاو. |
| کف | کەف |
| کرتوو | وەك خاکەناز وایە دێراوی پێ پاك دەکرێتەوە. |
| کوچك | بە بەردێ دەوترێ کەپڕ بەمشت بێ. |
| کونە تفنگ | کونەلووت |
| کۆخ | - قۆخ<br>- کولانەی مریشك ، قەل، قاز ...<br>- بەو ژوورە دەوترێ کە جووتیار لە شوێنی کێڵگەدا دروستی دەکات. |
| کوڕەبەشە | ناوی جۆرە ئاژەڵێکی کێوییە |
| کورەخانە | کورەی ئاگری ناوماڵ |
| کوچکە | جۆرەکڵاوێکی ژنانەیە |
| کۆرەگە | داری گەورەیە و ناوکەیان کۆڵیوە، ئاوی پیادەڕوا و ئاش پێدەگەڕێ. |
| کۆوەکە | کۆیکەرەوە |
| کۆخیلکە | خانووی بچووك |
| کروشە | ناوی کانییەکە لە گوندی ئیسێوە. |
| کرێن | شوێنی لێژ کە ئاوی پێوە |

| | |
|---|---|
| | نەوەستێ. |
| گرۆڵە | گلۆڵە |
| کۆڵەوەژ | ئەو دارەیە کەنانی لە تەنوور پێ دەردەهێنرێ. |
| کۆڵەوژ | بەو دارە دەوترێ کە نانی تەنوری پێدەر دەهێنێ. |
| کادێن | شوێنی کا |
| کابان | ژنی ماڵ |
| کەڵەباب | کەڵەشێر |
| کوندە | لە پێستی مەڕ و مالات درووست دەکرێت، ئاوی تێدەکرێت. |
| کوێوە دەچم | بۆ کوێوەدەچم |
| کولێنکە | هەواکێش |
| کۆپان | حەماڵ لە کۆڵی دەکات بۆ باربردن بەکاری دەهێنێت |

## پیتی (گ)

| | |
|---|---|
| گەڵیشك | گەڵاو لقە داری وشکەوەبوو |
| گەلۆر | کەسی تەمبەڵ لە ئیشدا |
| گەورە | دۆشەك |
| گەمە | گاڵتە |
| گرگە | جۆرە نەخۆشییەکی ئاژەڵە |
| گردان | جۆرەیارییەکی منداڵانەیە |

| | |
|---|---|
| گڕوێ | گەڕ |
| گۆڕێ | گۆڕەوی |
| گۆڕ | قەبر یان شوێنی تەخت و فراوان |
| گوێلك | گوێرەکە |
| گوێنی | جۆرە دەوەنێکی کوێستانییە، کەتیرەی لێدەردێ. |
| گوێ بەل | گوێ قوت |
| گوڵەدان | گەنمەشامی |
| گیاو گۆڵ | گژو گیا |
| گۆڵ | سەگی نێر |
| گومبەد | گوومەز |
| گوڵەکابە | گوڵی گوڵەبەڕۆژە |
| گرۆ | گرەو |
| گوێلك | گوێرەکە |
| گرت کردنەوە | کۆکردنەوە |
| گەز | بڕێکی پێوانەییە بۆ پێوانەی درێژی بەکاردێت. |

## پیتی (ل)

| | |
|---|---|
| لەخۆگرتن | خێرکردن |
| لەپێشچاوکەوتن | لەبەرچاوکەوتن |
| لەخۆبوونەوە | لەئێشبوونەوە |
| لەگەن | قاپی گەورە |

| | |
|---|---|
| لەچدای | لەچی دای، بۆ هەواڵ پرسین |
| لەپاش هاویشتن | خستنەپاڵ |
| لەلە | بریناركردنی داری دارەبەنە، بۆ ئەوەی بنێشتی لێبێتەدەر. |
| لەبار | باش و گونجاو |
| لیچ | لچ |
| لۆق | قاچی وڵاخ |
| لۆقە | جۆرێکــە لەڕۆشــتنی وڵاخ کــە ئازاری سوار دەدات. |
| لۆق هاوێژ | لەقە هاویشتنی گوێدرێژ |
| لۆقەلۆق | مەبەست لە قاچی گوێدرێژە کە چــەند جارێــك هەڵێــدەبڕێ و دەیکێشێ بەزەویدا. |
| لێکراکێشان | بەیەکدا کێشان |
| لماد | لباد |
| لۆس | ئەودارەیە کەنێرگەی پێدێننەوە . |
| لۆچ | چرچ |
| لمپ | لم |
| لەمێزکردن | لەباوەشکردن |
| لەبەرەوە | لەخوارەوە |
| لەدڵ بەگرانهاتن | پێنا خۆشبوون |
| لەبەرچوون – لەپشتبوونەوە | لەبارچوون |
| لەفلچی دمت بەم | لەناو دەمت بەم |

| | |
|---|---|
| لەبەریەك ڕاچوون | ڕووبەڕووی یەك بوونەوە |
| لینگ | قاچ |
| لێیدەڕی | لێیدەچێ |
| لەخۆڕا | لەخۆیەوە |
| لێرەڕا | لێرەوە |
| لێیڕاکێشا | پێداکێشا |

## پیتی (م)

| | |
|---|---|
| مەدوونە | خۆڵرێژ |
| مە | ئێمە |
| ماشتن | ماڵین |
| ماکورە | بەداری گەورەی وشك دەوترێ كە دووسێ بار داری تێدابێ. |
| مافووت – مافت | بەكەسێكی لات دەوترێ كە سەروەت و سامانی لەدەست دابێ. |
| مرلێنان | خۆپێداکێشان |
| ماشە | شێوازێكی تایبەتی ڕاوەماسییە |
| منداڵ و پاڵ | منداڵ و مەزن |
| مێچك | مێشك |
| مركانە | مۆرانە |
| مێكوك | جۆرەگیایەكە |
| مێشپەڕ | بە چرۆی تازەی مێو دەوترێ كە بەری بكەوی هەڵدەوەرێ. |

| | |
|---|---|
| ماڵخۆ | ماڵی خۆمان |
| مێشهەنگوینە | هەنگ |
| مێز | باوەش |
| مەیدان | مەبەست لە جێگەی پاڵەوانبازییە |
| مست | بۆکز |
| ملانەگرتن | زۆرانبازی |

## پیتی (ن)

| | |
|---|---|
| نەوی | نزم |
| نەقڵە | حیکایەت |
| ناشێ | نەزان |
| نانەشانی | تەیکەی نان |
| نێوان | بەین |
| نۆنەخشە | نۆبەرە |
| نیمە | نیوە |
| نۆبەتێ | لەرزوتا |
| نۆیەتە | نۆرەتە، سەرەتە |
| نێو | ناو |
| ناتراشێ | ناتاشێ |
| نێوقەد | ناوڕاست |
| نۆرچکێن | نۆرسکێن، یارییەکی فۆلکلۆریی کوردەوارییە |

## پیتی (ه)

| | |
|---|---|
| هەڵکشە | پچۆسەرەوە |
| هەمهەمە | واسواس |
| هەترۆ | ترۆ |
| هەڵقەندن | هەڵکەندن |
| هەنگڵ | باڵ |
| هەڵوجە | هەڵوژە |
| هاوێژکردن | جیاکردنـــــەوەی کاریلـــــە و بەرخۆلەیـە لـە دایکیـان لـە دوای شیر برینەوە. |
| هۆبا | وەك جنێوبەکاردێ |
| هەڵوێزان | تۆپەڵکردن |
| هەرزاڵ | شوێنی نوێن هەڵگرتن |
| هۆرە | – پواز<br>– جۆریکە لە مقامی کوردی. |
| هەیتی | هەیەتی |
| هەڵناڕوانێ | سەیری سەرەوە ناکا |
| هەنگوتك | گونکی هەویر |
| هەڵدەبا | بەرزدەکاتەوە |
| هەڕۆ | بڕۆ |
| هەڵهێنجان | دەرهێنان |
| هەردك | هەردوو |
| هەڵدەقەنین | هەڵدەکەنین |

## پیتی (و)

| | |
|---|---|
| وەڕزیکردن | بیرکردن |
| وەیدۆزە | بیدۆزەرەوە |
| وەیکە | بیکەرەوە |
| وەرەق | جۆرەتانجییەکـــە بەکـــەڵکی ڕاونایەت. |
| وەیکوژە | سەری بڕە |
| وان | ئەوان |
| وێکەوتن | بەرکەوتن |
| وێڵداش زاوا – وەڵداش زاوا | ئاوەڵزاوا |
| وەیسرە | بیسرە |
| وەمێنە | بمێنەرەوە |
| وەرکەوە | پاڵکەوە |
| وەدووکەوتن | دواکەوتن |
| وەگەڕێ | بگەڕێرەوە |
| وێیدە | بییەڕێ |
| وەویم هەڵدا | بەوا هەڵمدا |
| وەخەبەرهات | خەبەری بووەوە |
| وەجاح | شوێنی ئاگرکردنەوە |
| وەردەدا | دەتلایەوە |
| وەبەستە | ببەستەرەوە |
| وەیهێڵێن | بیهێڵێنەوە |
| وێدەدەم | دەتدەمەوە |
| وەرێکەوت | کەوتەڕێ |

| | |
|---|---|
| وەدەرینا | کردییەدەرەوە |
| وێدەدەین | دەیدەینێ |
| وەڕسبوون | بێتاقەتبوون |
| وەیخوێنە | بیخوێنەرەوە |
| وەفریاتدێین | فریاتدەکەوی |

# لسیتی بەراوردکردنی کتێب

١- ١٩٧٠، شەوچەرە، نووسەر: تاهیرئەحمەد حەوێز، چاپ: یەکەم، چ: دار السلام، ش: بەغداد.

٢- ١٩٧٠، هەڵەشەیی، نووسەر: ڕەزا شوان، چاپ: یەکەم، چ: سەلمان ئەعزەمی، ش: بەغداد.

٣- ١٩٧١- هەڵاڵە برایمەی هەورامان، نووسەر: ڕەشید هەورامی، چاپ: یەکەم، چ: ڕاپەڕین، ش: سلێمانی

٤- ١٩٧٩- بۆتان دەگێڕمەوە، چیرۆکەکانی نەجمەدین مەلا، ئامادەکردنی: بەیاد عەبدواقادر، چاپ: یەکەم، چ: ڕاپەڕین، ش: سلێمانی.

٥- ١٩٨٠ – هەبوو.. نەبوو، بەرهەڤکردنا: عەبدولڕەحمان نەقشبەندی، چاپ: یەکەم، چ: شەفیق، ش: بەغداد.

٦- ١٩٨٣- مزگێنی، نوسەر: محەمەد سەلیم سواری، چاپ: یەکەم، چ: دار ئفاق عەرەبییە، ش: بەغداد.

٧- ١٩٨٤- ڕیوی گەرمیان و کوێستان، ئامادەکردنی: عومەر ئیبراهیم عەزیز، چاپ: یەکەم، چ: الادیب، ش: بەغدا.

٨-١٩٨٤- شەوانی گوێ ئاگردان، نووسەر: جەلال تەقی، چاپ: یەکەم، چ: زانکۆی سەلاحەدین، ش: هەولێر.

٩- ١٩٨٤- بیست چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی، نووسەر: د. کوردستان موکریانی، چاپ: یەکەم، چ: ڕۆشنبیری، ش: هەولێر.

١٠- ١٩٨٥- هەقایەتی کوردی، ئامادەکردنی: محەمەد کەریم شەریف، چاپ: یەکەم، چ: دار جاحز، ش: بەغداد.

١١- ١٩٨٦- تێکستی هەشت چیرۆکی ئەفسانەیی کوردی، ئامادەکردنی: تاریق جامباز، چاپ: یەکەم، چ: عەلا، ش: بەغداد.

١٢- ١٩٨٧- تێکستی چەند هەقایەتێکی فۆلکلۆری کوردی، ئادادەکردنی: سەعدوڵلا ئیسماعیل شێخانی، چاپ: یەکەم، چ: الحەوادس، ش: بەغداد.

١٣- ١٩٩٠- بەهرەمی پاڵەوان، ئامادەکردنی: جەمیل ئیسماعیل گردە سووری، چاپ: یەکەم، چ: الزمان، ش: بەغداد.

١٤- ١٩٩٠- شەوانی جاران، ئامادەکردنی: بەهادین جەلال مستەفا، چاپ: یەکەم، چ: الحوادس، ش: بەغداد.

١٥- ١٩٩٠- چل گەز، ئامادەکردنی تاریق جامباز، چاپ: یەکەم، چ: چاپخانەی ڕۆشنبیری لاوان، ش: هەولێر.

١٦- ١٩٩١- هەڵبژاردەیەك لە چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی، کۆکردنەوەی: فاروق حەفید، چاپ: یەکەم، ش: سووید.

١٧- ١٩٩١- کۆمەڵە چیرۆکی فۆلکلۆری، کۆکردنەوەی: شەوکەت ئاڤدەل، چاپ: یەکەم، چ: خەبات، ش: دهۆك.

١٨- ١٩٩٦- شەوچەرەی زستان، نووسەر: عومەر عەبدولڕەحمان، ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا، چاپ: یەکەم، چ: کامەران، ش: سلێمانی.

١٩- ١٩٩٧- شەش چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی، نووسەر: محەحەد روشدی دزەیی، چاپ: یەکەم، چ: وەزارەتی ڕۆشنبیریی، ش: هەولێر.

٢٠- ١٩٩٨- ئەفسانەی شێتۆکە و ئاقڵۆکە، نووسەر: مەغدید ڕەواندزی، چاپ: یەکەم، چ: وەزارەتی ڕۆشنبیریی، ش: هەولێر.

٢١- ١٩٩٩- شەوچەرەی شار، ئامادەکردنی: ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشید، چاپ: یەکەم، چ: دلێر، ش: سلێمانی.

٢٢- ١٩٩٩- قەدەغە شکێن، نووسەر: مەولوود ئیبراهیم حەسەن، چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی.

٢٣- ٢٠٠٠- شێر و مشکە بچکۆلەکە، کۆکردنەوەی: سروە، چاپی یەکەم، چ: گڵبانت، چاپ، ش: تاران.

٢٤- ٢٠٠٠- شەو چرا، بەرهەڤکردنی: ڕەسووڵ وەیسی و سوارە فتووحی، بەرگی یەکەم، ش: ورمێ.

٢٥- ٢٠٠٠- کاڵەبەی، کۆکردنەوەی: ڕەئوف مەحموود پوور، چاپ: یەکەم، ش، هەمەدان.

٢٦- ٢٠٠١- شەوانی گوێ ئاگردان، جەلال تەقی، چاپ: یەکەم، چ:؟، ش:؟.

٢٧- ٢٠٠١- گەوهەری دێرینە، بەرگی یەکەم، کۆکردنەوەی محەمەد ساڵح سەعید، چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی.

٢٨- ٢٠٠١- سەرگوزەشتەی دیوەخان، نووسەر: سەباح ئەسعەد نەجم، چاپ: یەکەم، چ:؟،

٢٩- ٢٠٠١- سەمای ئەجندان، نووسەر خالید جوتیار، چاپ: یەکەم، چ:؟، ش: کۆیە.

٣٠- ٢٠٠١- بزەی سەرلێوان و شەوچەرەی دیوەخان، نووسەر: داود قەرەلوسی، چاپ: یەکەم، چ:؟، ش: تاران.

٣١- ٢٠٠٢- چارەنووس، نووسەر: ئازاد هیدایەت دەلۆ، چاپ: یەکەم، چ: چرا، ش: هەولێر.

٣٢- ٢٠٠٣کۆمەڵە چیرۆکی کوردیی، کۆکردنەوەی: عەلی ئەشرەف دەروێشیان، چاپ: دووەم

٣٣- ٢٠٠٣- شەش پێی بەحری، کۆکردنەوەی: د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چاپ: یەکەم، چ: ڕۆشنبیریی، ش: هەولێر.

٣٤- ٢٠٠٤، ئەفسانەی لوڕ، ئەفسانەی لوڕ و بەختیاریی و شوشتەیی، کۆکردنەوەی: داریوش ڕەحمانیان، وەرگێڕان: عزیز گەردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەدەم، سلێمانی.

٣٥- ٢٠١١، ئەفسانەی تورکیایی، نوسینی: بەربارا وۆکەر، وەرگێڕانی: عەزیز گەردی، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر.

٣٦- ٢٠١٣، ئەفسانەی ئەستەنبوڵی، نووسینی: ئیشك سوکان، وەرگێڕانی: عەزیز گەردی، ناوەندی ئاوێر، هەولێر.

٣٧- ٢٠١٥، ئەفسانەی مازندەران و تورکمەن سەحرایی، وەرگێڕان: عەزیز گەردی، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر.

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا:

١٩٧٥ لە شاری سلێمانی، لەدایکبووە.

١٩٩٧ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی، لە زمان و ئەدەبی کوردیی لە بەشی کوردیی، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی وەرگرتووە.

کاری ئێستای: مامۆستای قۆناغی ئامادەیی.

# بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:

١ – ٢٠٠٣، چەپکێك لە کەلەپوری گوندی ئیسیۆە، لە هەرێمی کوردستانی ئێراق، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان، هەولێر.

٢ – ٢٠٠٥، ختکە سوور، پێنج چیرۆکی فۆلکلۆریی کوردیی منداڵانە، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس، ٢٠٠٧ هەولێر.

٣ – ٢٠٠٦، هەندێ میوە و خواردنی فۆلکلۆریی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.

٤ – ٢٠٠٦، کۆمەڵێك مەتەڵ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.

٥ – ٢٠٠٧، کۆمەڵێك یاریی فۆلکلۆریی، چاپخانەی ئاراس، هەولێر.

٦ – ٢٠٠٨، پەندی پێشینانی، چاپخانەی ئاراس، هەولێر.

٧ – ٢٠١١، بازی زێڕین، کۆمەڵێك چیرۆکی ئەفسانەیی، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی.

٨– ٢٠١٤، مریشکە پەڕبەڵەکە، کۆمەڵێك چیرۆکی منداڵان، چاپخانەی ئینستیوتی کەلەپوری کورد، سلێمانی.